# لەم ژمارەیەدا




رۆشنبیری نوێ

گۆڤارێکی گشتی مانگانەیە

دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية ـ ساحة الفلاني بغداد

تەلەفۆن: ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

سەرنووسەر

اسماعيل رسول

جێگری سەرنووسەر

فائق جميل

له ڕوانگەی زمانەوانیەوە:

# گیروگرفتەکانی نووسینی وشەی لێکدراو

* رؤوف احمد ئالائی *

ئەگەر تائێستاو تارادەیەك بەسەر تەگەرەی نووسینی بیجگەی وشەی لێكدراودا ـ زاڵبووبین ، ئەم بابەتەیان هەروەها بەئاڵۆزی ماوەتەوەو لە بێنەوبەرەی نووسینی هەموشێوەدایە ، ئەمەش لەبەر ئەوەیەکە تائێستا لەتۆژینەوەی ڕێزماندا چەندیەتو چۆنیەتی لێكدراو ساغنەکراوەتەوە ، چ لەبارەی وشەسازیەوەو چ لەبارەی ڕێنووسەوە !!

له باوەڕیمندا لێكدراو بڕبڕەپشتی زمانی کوردیە .. وەك موعجیزە سەیری‌دەکەم .. شاشەیەکی ئەفسوونیەو مێژووی دێرینی تێدادەورنگێتەوە .. چیرۆكو داستانە . گەردبینە !! ئامێرێکی تۆمارگەرو وێنەگرە .. پارچەکانی وشەی لێكدراو هەریەکەیان دوگمەی وینەمۆیەکی هێزبەخشی جاویدانیە ..

هەرئەوەندم لەدەستدێ‌کە لەئاقار شکۆی وشەی لێكدراودا ، بەچۆکدابێم .. لەمەیدانی بەررەهایی‌و بێ‌دەربەستانەماندا ، ملکەچ‌ببم !!

دەستمایەی دەولەمەندیی زمانی‌کوردی ، ئەوەندەی خودا حەزبکا ، وشەی لێكدراوە کە بی‌گەیەنێتە پۆیەی هێزوپێز .. لەسایەی ئەوەوە بۆ هیچ زاراوەیەکی زانستی‌و ئەدەبی دۆش‌دانامێنین . داخەکەم ! لەژێر پەردەی ڕێنووسدا بۆم‌نالوێ‌کە مەودای‌بدەمێ !!

بەکورتی ئەوەندەی ناسك‌و گرنگە پتر بێ‌نازە لە مەیدانی زمانەوانیماندا !!

**١ ـ نووسینی وشەی دارێژراو :**

ئەو بەشەن کە بەپاشی‌گرو پێش‌گری تایبەتی دروستدەبێ بۆ مەبەستی وێ ، ئەو مۆرفیمەی‌کە دەکەوێتە گەڵ وشە سەرەکیەکە ، سەربەخۆیانە مەبەستو گوزارو ڕاناگەیەنێ .. یان بەتەنی بەکارناهێنرێ ، جا بەهۆی سوانەوەوەبێ یان لەنبەرەتدا ـ وەك ئامرازێکی ڕێزمانی ـ دابەزیبێ، بەخواستی ڕێنووس ـ نەك کرۆکزانیی وشە ـ برێکیان لێ‌دەخەمە بەرچاو :

| پاشگر | وشەی دارێژراو |
| --- | --- |
| ـ ە | بست ـ بستە |
| ـ ەك | کورت ـ کورتەك |
| ـ ۆك | ئارام ـ ئارامۆك |

| | | |
|---|---|---|
| ـ ك | دست ـ دەسك ( ik ) | |
| ـ چ | باخ ـ باخچە | |
| ـ دان | خوێ ـ خوێدان | |
| ـ ستان | کورد ـ کوردستان | |
| ـ دار | ماڵ ـ ماڵدار | |
| ـ یار | نووس ـ نووسیار | |
| ـ گەر | مس ـ مسگەر .. هتد | |

ئەم وشە داڕێژراوانەو زۆرەهای دی ، بەبێ دەمەقاڵێ بەسەریەکەوە دەنووسرێن ، چونکە بەتەنێ ئەو مۆرفێمانە سەربەخۆنین لەگوزارەدا ، لەکاتی پێوەلکاندنا کارتێکرانێك دەسازێ بۆ مەبەستی تازە لەبارلێگۆڕینەوە یان لەبزووتنەوەی پەیدابیدا بەبارێکی فیزکی تایبەتیدا ، بۆ یەکالای ئەرك ، ئێرە بەلەبار نازانم کە بینی لێبکرم .

**٢ ـ وشەی سواوەو تێکشکاو**

ئەو وشەلێکدراوانەن کە پێکهاتوون لەبەشێکی سەرەکیو بەشێکی پەیوەست ، یان بەشی لکێنی ، یان لە چەند بەشێك بەسواوەیی وتێکشکاوی جاڵامرازبن یان‌نا . ئەم بەشەیان لقوێژیی زۆرەو تەنها وەك نمونە ، برێکیان لێ‌دەخەمەروو ، بۆمەبەستی رێنووس .

**ا ـ ئامرازی لێکدراو :**

**لێك ـ لەیەك : لیکچوون**

**تیایا ـ تێی....دا تێیدانەماوە**

**ویکرا ـ بەیەکەوە ، تێك .... را**

**کلۆجێ ـ کلوجە ( عەرەبیە ) .**

ئەمانە ـ زۆربەیان ـ بەنەپساوەیی ، بەیەکەوە دەلکێن ، وەك ( هیچی ـ تێدا ـ نەماوە ) بەپساوەییش ، وەك (لێ + یان .... دا = تێیاندا)..

**ب ـ راناوی ئیشاری لەگەڵ هەندێ ئاوەڵکاردا :**

وەك : ( ئەمشەو ، ئەچرۆ ، ئەمساڵ ... هتد ) راناوەئیشاریەکە ئەرکی سەرکیی رستەسازی لێرەدا دۆڕاندوە ، دەوری ئامرازی شوناس دەبینێ ، ئەو وشانە جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەم رستانەی خوارەوەدا :

**( ئەم ساڵە ، ساڵێکی نەهاتە ، یان : ئەم ساڵە** نەهاتە دوایی‌نەهات ! ئەم شەوە زۆر تاریکە ) کەواتە وێنەی ( ئیمشەو ) بەیەکەوە دەنووسرێ ، بێجگە لەوەش کە سواوەتەوە ، کوردی‌نووسان بەوشێوە **لکانە راهاتوون ، بیانووش لەگۆڕێدایە کە راناوە** ئیشاریەکە ئەرکەسەرەکیەکەی نێو رستە سازی نابینێ .

**ج ـ وشەی تێکشکاو :**

**١ ـ لەیەکسەرەوە ، وەك :**

**ـــ زستان = زمستان = زوقم + ستان ـ بەبڕوای من .**

**ـــ زەیستان : زان = زایین + ستان = کاتی‌زان .**

**ـــ کوێستان = کۆ ، کوە + ستان = شوێنی کێو .**

**ـــ گورگاسا = گورك ناسا . بەسوانەوەی /=/.**

**ـــ دالاش = داڵ + واشە . لەواشە گەورەترە.**

**ـــ مریشك = مر + ئیشك = وشك**

**٢ ـ لە دووسەرەوە :**

وەك « خورمژ » کە بریتیمەلە ( خورماو مێوژ ) یان وەك « دەسار = دەست + هار .

پوختەی قسە ئەوەیەکە ئەوجۆرە وشانە بەیەکەوە بنووسرێن ، چونکە فۆرمەکەیان بریتیە لەگوزمەیەکی ، بەسەریەکدا جۆش‌دراو . لەولاشەوە دەستوورەکەیان سابتە .

**٣ ـ لێکدراو بەهۆی ئامرازی بەستنەوەوە :**

وەك : **« کوتومت ، مشتومڕ ، گفتوگۆ ... »**

بەیەکەوە نووسینیان بەکارێکی بەجێ‌دەزانم ، چونکە لە قاڵبی یەك‌وشەیی‌داو سەربەگەردان‌نین ، ئامرازەکەش هاوبەشی حوکمی‌رستە راناگەیەنێ ، زوربەی دووپارچە بەیەکەوەبەستراوەکان بەجیاجیا مەبەست‌ناگەیەنن ، دیسان پێ‌ویستە لەرکێفی رستەسازی دەربازبن ، کەواتە لکانی ئامرازەکە بەپارچەی پێشەوەی کارێکی ژیرانەیە ، بەلام دەبێ نووسەر ـ تائەندازەیەك ـ لە کەبنوبەینی ئامرازی بەستنەوە بەئاگابێ‌و هەست بەو مامەڵەیەبکا ، لەگەڵ ئەوەشدا دەستوورەکەی دابینکەرە .

### ٤ ـ وشەی جووتەنی :

هەندێ‌کەس دنووسن ( جووتە نـاو ) . ئەولێدانەوەیە بەرتەسکە ، بەتایبەتی بۆ ئەم‌شوێنە ، مەرج‌نیە تەنها لە دووناو پێك‌بێ ، وەك : «بەهبەه ... هەی هەی » یان لەچەند توخمێکی‌دی . وە ك:

« زەنازەنا ، سووك سووك ، زەقـزەق » ئەم بابەتە وشانە بەیەکەوە نانووسرێن ، چونکە بۆ دووبادی ( توکید ) ی حالەتن ، بێتو بنووسرێ ( زەقزەق ، سوکسووك ) ئەو تایبەت ( خاصیە )ە لەکیس دەچێ ، باری دەربڕین‌و شوێن بەرەو یەك‌وشەیی باناداتەوە ، بێجگەلەوەش رێ‌نووسەکەمان دەقی‌بەئەوەوەگرتوە ، کەبە جیاجیا بنووسرێن ، لەگەڵ ئەوەدابنم کەشتێك هەڵەنەبێ‌و بچەسپێ دەست‌کاری‌ی‌بکرێ .

### ٥ ـ لێك‌دراو لەچەند بەشێکی تەواو بەمەرجێ لەخێڵی کار نەبن :

نموونەی ئەوبابەتە وەك :

( دڵ‌شاد ، سۆسن‌خاڵ ، خەزێم‌شۆڕ ... )

لێرەدا سێ‌رای دوورونزیك دەخەمەبەرچاو :

ا ـ هەموویان بەسەریەکەوە بنووسرێن .

ب ـ هەموویان بەجیاجیا بنووسرێن .

ج ـ ئەگەر دیارناو « اسم علم » یان ناوی پیشەو شوێن بوون یان ناوی فەرهەنگی بوون ئەوا بەسەریەکەوە بنووسرێن : ئەگینا بەجیاجیا بنووسرێن .

رای‌سێیەم هی کوڕی‌زانیاری‌ی کوردە . بەم نموونەش راڤەیان‌کردوە : ( ئەگەر ـ بەنموونە ـ وشەی دڵ‌سۆز دیارناوبێ بەسەریەکەوە بنووسرێ ، وەك : دڵسوزی خوشکم ) ئەگەر ئاوەڵ‌ناوێ «صفە» بەجیاجیا بنووسرێ ، وەك : ( پیاوی دڵ‌سۆز ـ خۆشەویستە ) من لێرەدا رام‌جیاوازە ، هیچ نووسەرێك لە گەرمەی نووسیندا ، ئەو مەلەکەیەی بۆ پەیدانابێ‌و ئەوەندەش زەین‌تیژ نیە کەلەم رستەیەی خوارەوەدا :

سەری‌لێ‌تێك‌نەچێ : « دلسۆز بە دڵ‌سۆزی ئیش‌دەکا » !! بەحیسابی ئەوەی‌کە لەیەکەمیاندا دیارناوە بەیەکەوەو بە حیسابێ ئەوەی‌کە لەدوەمیشیاندا ئاوەڵەناوە بەجیاجیا بنووسرێ .

دیسان وشەی فەرهەنگی کە بووبە سەرباس‌و سەربەند ، دیارناوێکە بۆخۆی ، دەبێ بەبێ ریزپەڕ هەموویان لەسەرەتاوە بەیەکەوە بنووسرێن ، کە دەگاتە سەرراڤە لێك‌هەڵ بووەشێنەوە ، وەك لەم نموونانەدا « پێلێهەلبڕین ، شوولێهەلکیشان » ئەنجا لەراڤەکەدا هەڵ‌دەوەشێنەوە ، کە بەدوایاندا بکوترێ : « هۆمەر پیاوێکی پێ‌لێ‌هەڵبڕە ، واتە زێدەڕۆیە . »

ئەم‌ڕای لەمەڕێترە بە نەزەریەکی رووت‌دادەنێم ، ئەگەر باوەڕمان بەدەستوورسازی هەبێ ، حەوت ئەوەندە سفتی‌و کەم‌ئەرکی پاڵمان‌پێوبینی ، ئەو کارە نەسەری‌گرتوەو نەسەریش‌دەگرێ !!

بەرلەوەی‌کە بڕیاری خۆم‌بدەم ، ئەوەندە فێربووم کەوشەی لێك‌دراو لەرووی واتاو لە ئەرکی‌ڕستە سازیدا ، لەحوکمی سادەدایە ،

کەدەڵێین « میرگەسوور » واتای رەنگی سوور بۆ مێرگی شین ، رامۆش‌کراوە ، با لەرووی ئیتمۆلۆژیشەوە سەبارەتێکی هەبێ‌و لەدەستەواژەی « مێرگی سوور »ەوە هەڵ‌گەڕابێتەوە .

بیانووی هەرمەزن ئەوەیە کە وشەی لێك‌دراو لە حوکمی سادەدایەو کەخرایە قاڵبی لکانەوە زەینمان بۆ پارچەکانی‌و سەربەخوییان ناترازێ .

لەمانە بەئاگـامو لەهەموکەس پتر حەزلەوەدەکەم کە لەم‌سەری دێڕەوە بۆ ئەوپەڕی ، پیت لە پیت نەپسێتەوە ،

ئەگەر وشەلێك دراوەکان گشتیان وەك « گوڵنار » ی بوونایە ، لەوانەبوو داری خۆزگەمان بهاتایەتەبەر ؟ !

ئەم پرسیارە : بۆچی سڵ‌ناکەینەوە لەبچڕبچڕی‌ی ئەم وشەلێك‌دراوانەی خوارەوە، کەهیچ هیزێك‌و بەم یێتانە لەحیمیان‌ناگاو مەبەستیشیان نەدۆراندوە ؟! وەك « سەرچڵ ، بەرچنە ، پیرەمێرد ، شارەزوور ، راوەنگوین خەندەلێو ... هتد . »

ئەمە واو کەچی کە نووسیمان : « گوڵ‌ناز ، دڵ‌شاد ... » بەپچڕپچڕو ناساز دەدرێتە قەڵەم !! «١»

واقیع ئیسپاتی‌دەکا کەئەو جۆرە وشەلێك‌دراوانە سەرومڕو بەیەکەوە نووسراو هیچ‌دەستوورێك دابینیان‌ناکاو چارهەرئەوەیە کە بەسەریەکەوە نەنووسرێن ،

هەندێ کەس سوورن لەسەر ئەم قسەیە :

« تادەلوێ وشەی لێکدراو بەسەریەکــــەوە بنووسرێ ... »
ئەم ئامۆژگاریە رەبەق لە گیرفانی زانســــتدا جیگەی نابێتەوە .. بگرە خۆدزینەوەیــــە لـــــە دەستوورسازی !!
ئەگەر بەڵگەی پێوەلکان ئەوەبێ کەلەفارسـیو عەرەبیدا وشەی لێکدراو بەسەریەکەوە دەنووسن ، جارێ بەتاوی زمانی دیکە کەمتابێژێــــك وشـــــەی لێکدراو کەوتوەتە عەرەبیەوە ، لێکدراو لەتایبەتــــی ئەوزمانە نیەو لەگەڵ ( نحو )ە کەیان ناگونجێ، بێجگە لەوەش چ ئەوان چ فارســـەکان رێنووســـەکـەیان ناتەواوە پشــــتبەبزوێن نووســــین نابەســـتنو پترکارەکەیان داوەتە دەست سەلیقەو بیستەنی ئنجا بادانەوە بۆ رێکخوێندنەوە !!
بەڵگەیەکی دیکـــــەی زیربێژیانــــــە بـــۆ پێکەوەنەنووسانی لێکدراوی پارچەتەواو :
وشەی لێکدراو لەخۆیدا لێدانەوەیەکی کورتی ئەندازیانەیە ، چۆنێتێ دابەزینەکەی راڤەدەکاتەوە ، بەنموونە کە نووسیمان : (دڵشاد) سەرنج رادەکێشێ بۆ فۆرمو قەبارەی ئەو شتە کەبە وشەی ( دڵ ) دەردەبردرێ بۆ لێ وردبوونەوەی وشەی ( شاد ) ئنجا پەیوەندیی ئەم دوانەو سازدانی وشە نوێیەکە بـۆ مەبەستی تازە ، کە کەسێکە ناودێرە بە شادملـیو دەروون ئاسوودەی ، ئەگەر لەخۆشێ ـ دا وانەبێ لەپێشەوە گەشیبینی بۆ دەگوترێ . ئەم نیمچــــە چیرۆکە لە تاکەتاکەی پارچە وشەکانەوە دەزێتەوە ، ئەوەشت لەبیر نابالەوە کەمەبەست تاکە کەسێکــــی ناودێرە بەهەمان جووتە وشەی بەسەریەکەوە .

**ـ لێکدراو لە وشەوکار :**
بەمەرجێ وشەکە ئامرازو پێشگر نەبێ ، وەك :
١ ـ ناو + کار : دەستگرتن ، ســــەردان ، حەجکردن ، جەرگبڕ ...
٢ ـ ئاوەڵکار + کار : لاکردنەوە ، نێوئاخن ، لامێژ ، پاڵخستن ....
٣ ـ صیفە + کار : چاککردن ، مانگرتن ، شیکردنەوە .
تائێستا هیچ زمانــــەوانو رێنووســــەوانێـك ئەم چەشنە لێکدراوانەی بەیەکجوونە نەنووسیون !! هەروەها بەلەقیو ئالۆزکاوی لەهێناوبردندان .

راستیەکەو بۆ یەکەمجار دەیدرکێنم :
باری رەوانبێــــژی ـ کــــە کالای زمانـــــە ـ لەسەرکێلیەوە گوبەندێکی خستوەتەوە بەتایبەتی لـــە رێزماندا بەرێنووسەوە چونکە ئەوەندەی لەئاوێنەی زمانی دەرەکیەوە ، سەیری فەسالی وشەی لێکدراو دکەین ، لەخودی روخساری خۆیان وردنابینەوە ، کەدەڵێینو دەنووسین ( پێشکەوتن ) بەبالای وشەی ( تقدم ) ی سادەی دەبڕین یان ( چاککردنەوە ) بـــە ( اصلاح ) و ( شیکردنەوە ( تحلیل ) پەنجە کێـــــش دەکەین . بەتێڕامانی لایەنە خوازەکاریەکە ، واتای بەرایی ( لغوی ) کەبنیادی شکڵنووسی وشـــــەی لەسەر دەکرێ لەزەینی نووسەرەکـــەدا فـــەرامۆش دەبـێ ... دەمێکە هـــەســـتم بەئـــەوەکردوەو باریدەروونیی خۆیشـــم لەو کاریگـــەربوونـــە نەخەلستوە .
گوتم بەیەکەوەنووسینی ئەو جۆرە لێکدراوانە بەتێکرا سەر ناگرێ ، گریمان نووسیمان«چاککردنەوە» دوای تۆزێ لەگەرداندا هەڵدەوەشێتەوە ، وەك :
( چاکیانکردەوە ، چاکیکرد ، چاکمانکـــرد ، چاکنەکرا .... )

**گیروگرفتەکانی « کاریلێکدراو »**
یەکێکە لەوبابەتە واشانەیکە نووسینەکـــەی لەنێوان چەندان رای جیاوازدا گێژدەخواتـــەوە ، تائێستا هیچنووسەرێك بارێکی یەکسانی تێـــــدا رەجاونەکردوە .
١ ـ کاری پێکهاتوو لەبەشی پەیدایو پێشگر:
أ ـ هــەڵ + کێشـــان ، هـــەڵدەکێشێ ، هەڵمەکێشە ....
ب ـ دا ، را ، رۆ + .... دابەڕین، راپەڕین، رۆچوون .
بەشی ( ب ) لەخۆیدا نەلکاوە .
ج ـ پریپۆزیشن : لێ ، پێ ، تێ ، بەجێ ... + کار .
وەك « لێخوڕین ، لێمانخوڕی ، پێگوتن ، پێمگوت ... »
د ـ ئاوەڵکار + پریپۆزیشن + کار . وەك :
« رێتێچوون ، رێبی تێدەچێ ، روولێنان ، روومانلێنان »
سەرەرای ئەوەشکە پریپۆزیشن توخمێکی سەربەخۆیە لەکەرەسەی زماندا ، ئەگەر لەگــــەڵ

چاوگەکاندا بشلکێن ، لەبڕێکداو لەدۆخی گەردانــدا هەڵدەوەشێنەوە ، وەك :

« ڕلێتێچوون ، ڕێم تێ نەچوو »

هـ ـ یان پێـكبێ لەچەنـــد پری پۆزیشنێك و پێش گرو کار ، وەك : « پێ + لێ + هەڵ + برین »
تەنها ئەم کارە لەنێوان پێنج شێوە ئیملادا لــە گیروگازدایە ، هیچ دەستوورێك ناتوانێ بەیەك شێوە دابینی بکا ، بێجگەلەوەی کە بەسەریەکەوە نەنووسرێ.

**٢ ـ کار + نیشانە :**

وەك ( هات + وە = هاتوە = هاتکە )
زۆر لەزمانەوانان دەنووسن « هاتووە » بەدوو / .. وو / . ئەمەش هەڵەیەو چاوی لێ ناپۆشرێ ، چونکە نیشانەکە تەنها بریتیەلە « وە = گە » وەك لە « زانیوە » دا ، خۆی دەنوێنێ .
تائێستا لەئیملای سەر بەئەلفوبێنی عەرەبیدا ، نیشانە بۆ نیمچە ژێرو بۆر دانەنراوە ، ناشتوانرێ هەمان بزوێنی «ی،و» یان بۆ دابنرێ . ئەمە باسێکەو لەکاتی خۆیدا درێــــژەم پـــێداوەو مـــاوەی لێ هەڵچوونەوەم نیە !! دوورنەڕۆین هەمان کـــاری پێشوو بە شێوە لاتینی بەم چەشنە دەبێ : ( هاتوە = Hatiwe )

**٣ ـ کار + پاش گر :**
وەك ( هاتەوە = هات + ەوە )
گیروگرفتی تێدانیە ، بەڵام لەو کارانەدا کـــە کۆتاییان بە / .. وو / یە ، هەڵەی تێداکراوە ، وەك « بوو + ەوە » ڕاستیەکەی دەبێتە « بوەوە » کەچی هەردەنووسن « بۆوە » .. ئەگەر لەزمانی نووسیندا، بەوشێوەیە تاوبدرێ هەڵەیە با لە زمانی قسەشــدا دروستبێ !!

٤ ـ کار + نیشانە + ئێنفۆنیك + پاش گر ، وەك :
هات + وە + ت + ەوە = هاتوەتەوە/کەچی بەهەڵە دەنووسن : ( هاتۆتەوە ، یان هاتووتەوە ... )

حزبی سەرکردە بە سەرکردایەتی کردنی هەڵمەتی گشتی نیشتمانی لە ناوبردنی نەخوێندەواری تیوری مرۆڤانەی خۆی خستە ڕوو .

(١) ئەوانەی کە دەنووسن : داتاشراو = منحوت ، پتر بۆ ( مشتق ) بەکارەو سەربەگەردانە .

(٢) وشەی ـ ستان ـ سەنسکریتیە ، بەواتـــای کات ، شوێن دەورێکی سەرەکی دەبینێ لەزمانی کوردی ، فارسی ، هیندیدا ئەگەر لە بنچینەشدا سەربەخۆبووبێ ، ئێستا لەبەکارهێنانی ئێمەدا، بە تەنێ بێ مەبەستە ، لە نووسینیشدا ، دەلکێ .

(٣) نیکایەك :
لەنووسینەوەی بەرهەمەکانی ئەم دوایەمـــدا «وە»ی برگەم بەکارنەهێناوە :
ا ـ بۆم دەرکەوتوە کە بەتاوی عەرەبی خۆی لەکوردی هـــەڵخزانـــدوە .. واوی ئیبتیدائی لەزمانەکەماندا ناسازە
ب ـ ئەو نووسەرانەی کە بەکاری دەهێنن ، یان بەکاریگەری ی عەرەبیەکەیە ، یـــــان لەجۆشتدانی بەندو ڕستەی کوردیدا ، بێ دەسەلاتن .

(٤) من بەش بەحالی خوم هەروەك ئەو مەردومکەلە بەلەقی و هەمەچیـــزە وشـــــەی لێكدراوم نووسیوە ، ناچاریش بووم ، چونکە وەك خاوەن را یـــەحس بـــەرهـــەمم لـــەرێ نووسەوانیــدا پێش کەش نەکردبوو . لەئەنجامـــی بەراوردداو ددان نان بەواقیعــدا ، ئەم بەحسەم تەقاندەوەو زنجیرەیەکم ، بە چەند ئالقــە لــەرۆژنامـــەی هاوکاریدا بلاوکردەوە .

# ئاوانێ دیاردە چاوغەڵە تێوەکان

ئەم جیهانە بێ‌سەروبنە ، بێ‌سنوور و کۆتاییە ، کەس تێ‌بڕنەکردوەی وا لەبـــەر چاوو هەســـتو هۆشماندا ، بەڕوالەت ، هێندە کراوەیە هەر دەڵێی بانگەوازی ئاشکرایی و دەروون‌شکانی خۆی بەبـــەر گوێی بیەردا بەرز هەڵدەبڕێ ، کە لێی ورد دەبیتەوە دەبینیت دەوراندەورتی تەنیوەتەوە بە تەڵەی فکر و تەپکەی هۆشی ئەوتۆ کە هەر یەکێکی لەوانەیە بـــە نرووکە چاوێك چەند خلیسـك بە نیگات ببات بۆ ناو زیندانە داخراوەکانی .

من لێرەدا نامەوێ ڕێی کورت درێژ بکەمەوە بۆ باسە دوورە دەست و پەنامەکی و وردەکانی فەلسەفە و میتافیزیك و ماتەماتیك و .. تیك .. و تیك و هەزار و یەك تیك و .. ئیزم ( ism ) ی زانا و پسپۆڕ و پەندیار و ڕابەرە وردبێو و تەنـــكدابڕ و هێماساز و زارقەڵەبالغی زانـــــتە بەدەرگـــە و دۆڵابەکان و هەنەرە لوول‌خـــواردوەکان و فێڵ‌وفڕە خۆ ـ دابێچاوەکان ، کە لەواندا تەپکەی فکر بـــۆ زاناکان نراوەتەوە نەك بۆ زوربەی خەڵق چونکـــە زوربەی خەڵق هەستیان پێ‌ناکەن تا تێیان بکـەون مەگەر لە ڕێگەی بەعەڵەچوون و سەرلێ‌شێوانـــی زاناکان لەو تەپکانەدا ساکارەکانیش بەدوا ئەوانـــدا پاندی تەپکەکان بن وەك کە قوتابی لە شێوەی تووتی قـــەی مامۆستاکانـــی دەڵێتەوە دیـــارە زوربەی خەڵقیش لە تەك ئەو زانایانـــەدا وەك قوتـــابی و بەرەژێرتریشن . ئنجا بۆیەیە لێرەدا تەنها دەست بۆ تەپکەی ئاشکرا دەبەم کە هەموو چاوێك دەیبینێت و پێیەوە دەبێت ، ناوناوەیەك نەبێ ، کە بەپێی داخوازی، سەرکێلێکی هەندێ تەپکەی نابەرچاو دەکەم . بەڵام لە پێشەوە دڵ خۆشکەریەکی مرۆڤی ساکار دەدەمەوە [ کە خۆم یەکێکیانم ] بەوەدا بەشـــێکی تەپکـــە بەرچاوەکان لەکۆنەوە ڕابەرەکانیش وەك ئێمە لێـــی بەسەهوو دەچوون و تێی دەکەوتن و لێکدانـــەوەی زانستییانەی ئەوسایان لێ‌هەڵدێنجا ، واتە شـەرمی تێوەگلانی ساقیلکانە بایی نوشتوویەکی بەپێز بەسەر شانی ئەوانیشدا دەدوورا ، هەر لەم نووسینەشدا ئەم لایەنەت بە بەر چاورا تێ‌دەپەڕێ .

مرۆڤ یەکەم تێوەڕامانی هۆشدارانەی بەرەو شتێکی ڕوون و ئاشکرا و بەرز و پان و خاوێن بوە کە ئەگەر لە ئاستیدا بە سەهوو چووبێت بە زۆر لەســـەری کەوتبێت ئەویش ( ئاسمان ) ە بە خۆی و بەرزی و جوانی و ڕەنگینی و مانـگ و ئەســـتێرە و هەور و برووسکە و کاکێشان و .. و .. یەوە ، هەر لەیەکەم نیگاشیەوە لێی بەسەهوو چوو کە وایزانی شـــینە [چونکە شین نییە]کە وایزانی گونبەتە [ ..گونبەت نییە ] ، کە وایزانی سەرقاپە بە سەر زەویدا نخوون بۆتەوە [ نە سەرقاپە و نە نخوون بۆتەوە [ ، کـە وایزانی بگیری بوونەوەرە گەشە ئاسمانیەکانە [ نە بگیرە و نە هیچ .. ] ، دواتریش کە فەلەکناسەکان بە وردبوونەوە لە بزووتنـــەوەی ئەو بوونـــەوەرە ئاسمانییانە حەوت هەشت فەلەکی تەبەق لەســـەر تەبەقی بێ لیك و دەرزیان کردە هەڵـسووڕێنی چەرخ و دۆلابی هەموو جیهان ، خۆیان و زانستی زێـــدە گرنگی فەلەکیان لەو بەرزاییەوە بردە ناو زیندانێکی فکری وەها کە دوو هەزار ساڵێکی پێ چوو تاکو لە سەردەمی کۆپەرنیکۆس و گالیلیۆ بەر لە ..٤ ساڵێك دوای ترس و لەرز و قوربانی و زمان بڕین و کافـر کردن و سووتاندنی چەندین بێ‌خەتایان تەبەقەکـان پێچرانەوە و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە وەستاوەکان و گەڕۆکەکان لە کاروانی شەوانە و ڕۆژانەی ئەزەلـی ڕەها کران و هەر یەکەیان بە پێی لێ‌بڕ کردنی هۆشی فەلەکناسەکانی ئەو سەردەمە بێشکەی حەسانەوەیان بۆ ساز درا ، مانگ‌و ئەستێرە گەڕۆکەکانیش مانەوە لەسەر تاکە بزووتنەوەی تایبەتی خۆیان کە پێوەندی بە هەڵاتن و ئاوابوونەوە نییە . ئنجا کە ئەمە کـــرا بەکـسەر و بەناچاری ( مامە زەوی ) کە تاکو ئەو کاتە لە مەرکەزی جیهان پالی لێ دابۆوە خرابە گەڕو کرایە

بەرپرسیاری ئەو چاوبەستەکێیە زلەی کە بزووتن و گەڕان و سووڕانی ئاسمان و بوونەوەرە پرشنگدارەکانی لە هۆشی مرۆڤیان دەکرد چونکە دەرکەوت (زەوی) خۆی بوو دەسووڕا و دەبزووت و ئاسمانی لە بەر چاوی سافیلکە و پسپۆڕاندا دەکردە چەرخو فەلەك .

تۆ ئەگەر بیر بکەیتەوە لە چاوبەستەکێکە تا هەڵوەشانەوەی ، کە هێشتاکەش بایی سەردڕێکی لێماوەتەوە ، ئنجا بگەڕێیت بەدوا ئەو کارەزێدە گرنگ و بە ئەرك و ژان و زوارەی کە کردۆتیە سەر زیهن و باوەڕ و ئایین و زانست و هونەر و ئەفسانە و .. و .. بەدرێژایی مێژووی مرۆڤ سەیرت لەوە دێتەوە کە چۆن مێشك و دڵ و دەروون و ناخی هەست و نەستی مرۆڤ هەر لە ڕسکانیەوە مەحکووم بوە بەو دیمەنە بێڕەزایە چاوغەڵەتێنە هۆشحەپەسێنە گیانوروژێنەی پاك و ڕوون و بەرزوهیچوپووچەش. وەها تێنەگەی تەپکەی ( ئاسمان )ە شینی یان هەروا بەسێنایی و بێ سەروسەمەرە و کاریگەری هۆشی مرۆڤی لە خۆیدا حەشار دا تا ئەو ڕۆژگارەی کە بەرەوپێش چۆونی زانست فێڵەکەی بۆ دۆزیەوە ئەویش وەك دیلی حوکمتەواوکردوو لێی دەرچوو . لە تاو و کاریگەری دیمەنی ئاسمان بۆ ناو دڵ و دەروونی ئادەمیزاد ئەوەندە بەسە کە بەشی هەرەگەورە و پیرۆزی ئەوەی پێی دەڵێین (ژوورخان ـ بناء فوقي)ی کۆنینەی ئادەمیزاد راستە و خۆ و بێ مامۆستا و یەکسەر لەو شینە پانەوە بۆی شۆڕ بۆتەوە ، تەنانەت بۆ ماوەی دوور و درێژی هەزاران ساڵ بە (خوا)ناسراوە وەیا هەرنەبێ هێندەی خوا هێز و پیرۆزی پێبەخشراوە ، زۆریش لەو خوایانەی گەلان پەرستوویانن بەچکەی ئەو ئاسمانە بوون . گوێ بگرە لە وتوویژی دیندارو پەندیار و شاعیر و قسەکەر و ڕیشسپی و حیکایەتخوانی گەلانی هەزاران ساڵ لەمەوبەر لێیان دەبیەیت کە چارەنووسی مرۆڤ لە ئەگیری ئەو شینە پانەیە نەك لە گەنم و جۆ و بەرخ و گیسکێکی پێی دەوێت ، بەرخ و گەنمەکەشی مەحکوومی ئەو بڕیارەیە کە ئاسمانو هێزە نهێنیەکانی پێی ڕەوا دیتوون تەنانەت گیسکی بۆ هەزاران سەرنەبڕیوە ئەگەر بە نیازی ڕازی کردنی ئاسمان نەبوو بێت . چەند سەیرە بەزەیی مرۆڤ بۆ ئاسمان بەرز بێتەوە ئنجا لەوێوە بە سەر برسیو لێقەوماودا نشێو بێتەوە پیاوەتیەکەش بۆ ئاسمان حیساب بکرێت

ئەم ( قدریە ـ Fatalism ) مش تا بەرەو چینی هەژار و زەحمەتکێش و نەخوێندوو دەبوویەوە پتر ئەستوور و خەست دەبوو تا ئەوەی قسەیەکی مەیلەو ئازادی بابایەکی مێشك کراوە لای ئەو کەڕەوارانە بە کفر لەقەڵەم دەدرا ئێستاش پاشماوەی ئەم حاڵە هەر بەرچاوە .

بەدوادا گەڕانی هەزاران هەزار ئایدیۆلۆجیا و باوەڕ و ئەرکی مادی و پاداشی مەعنەوی و پەلەفرەی گیان و شاگەشکەبوونی دڵ و شەڕ و ئاشتی و جموجووڵ و جانفیدایی .. و .. و .. کە ئاسمان بە سەر مرۆڤیدا بڕیوە بۆ لێکدانەوەی خوێنەر بەجێ دەهێڵم چونکە کارێك نییە من وەیا یەکێکی دیکە بە نووسین و بەئاخاوتن لێی بەکۆتایی بکات . ئاسمان گەورەترین و کۆنترین و وردترین و قووڵترین فێڵی لە هۆشی سافیلکان کردوە ، هەزاران هەزار دنیا پەرستیش بە ناو ئەو فێڵەدا بۆ ئومێد و ترسی ئەو سافیلکانە چوە و بۆ خۆی دابڕیون ، پیاوی ئایینی فکر ڕوونیش بەشێکی هەوڵ و تەقەلای بۆ ڕیسوا کردنی ئەو تەرزە تەڵەکەبازیە بووە بەڵام چی بۆ کراوە ؟ ئەگەر خوێنەر لێشم ناسەلمێنێ ، کوردی گوتەنی ، ئەمە گەز و ئەمەش ڕابردووی مرۆڤ بڕۆ بیپێوە .

مرۆڤ کە نیگای لە ئاسمان بەر بووە سەر زەوی ، دیسانەوە ، دەکەوێتە ناو تەپکەهای بەگرێوگاڵ و بەبێنەوبەرە کە دەبینێ زەوی وەك ئەستووکی نانەوا لەبەر دەست و دەمیدا بەهەموو لایەکدا پان بۆتەوە و بە پەراوێزی ئاسمانەوە نووساوە بێ تەقەڵ و بێ تیك . لەم ڕواڵەتەوە بۆ ئەوە چوو کە ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان هەر جارە لە زەویەوە دەردێن و بە چەرخو فەلەکی ئاسماندا لە ئەنجامی گەشتێکی نیو ئاڵقەیدا دەچنەوە ناو هەناوی ڕۆژاوای زەوی و دەحەسێنەوە بۆ گەشتێکی نوێی سەرلەبەیانی . هەندێك لەو کەسانەی شەبدای جەبەڕووتی هێزی پەنامەکین ، تا ئەو ڕادەیەی بە قسەکانیاندا دەسەڵاتیشی بۆ دەخوازنەوە ، وەهایان لایەنی دەسەڵاتی ئەزەلی دیت بڵێن لە سەرەتای هەر بەیانییەکدا ڕۆژێکی تازە دروست دەکرێت و لە کۆنە چەرخو فەلەکە ڕێدەنیشێت . هەر ئەم قسەیە سەرمڕای خۆشکەڵەیی ، پتریش لەگەڵ قودسیەتی ئاسمان و ڕووناکایی و بەرزایی دەگونجێت لەوەی هەر شەوە ڕۆژی نوورانی بچێتە ناو باخەڵی خاکی

ساردوسڕ و بەتەپوتۆز و تاریك ، خۆ ئەگەر بشێ لە کاتی ڕۆژگیران و مانگگیراندا بە تەنەکە لێدان حووتە قووتدەرەکە بترسێت و یەقیان بکاتەوە ، ئەو هەموو تەبەقلەسەرتەبەقیخاك و بەردەی کە بەشەو ڕۆژەکەی تێدا حەشار دەدرێ لەوانە نییە ڕێ بەهیچ گرمە و لرمەیەك بدا بەرەو تاریکستان و غەیبستانی هەناویەوە بروات ، ئنجا حووتیش لەوێدا نییە بترسێ یا نەترسێ چونکە سەرلەبەری ئەستووکی زەوی ، وەك گوتمان ، کورسی نەعنای ڕۆژی قووت داوە ئیتر چی لەگەڵدا دەکرێ ئەگەر هات و ڕۆژەکەی نەدایەوە !! وا چاکە بەخشندەیی غەیب هەموو سبەینەیەك ڕۆژێکی تازە بە مەخلووقات ببەخشێت وەك بە درێژایی ئەزەل و ئەبەر ژیان و بوونی بەخشیوە و دەبەخشێت هەرچەند لە دەمێکیشەوە زاناکانی فەلەك بە خەڵقیان ڕاگەیاندبوو زەوی خڕە و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە لەبەر چاوان ئاودیوی ئاسۆی ڕۆژاوا دەبنەوەو قووت نادرێن بەڵکو لە وڵاتێکیدیکە هەڵدێنەوە تا سووڕی تەواو بەدەوری زەویدا دەکەن و لە ئاسۆی ڕۆژهەڵاتەوە سبەینان قوت دەبنەوە ، لەگەڵ ئەمەشدا لە چەند فەلەکناس و سوختەی زیرەك بەولاوە کەسی سافیلکە بەدوا ئەو تەرزە قسە بەرەواژانە نەکەوت ، تەنانەت مەلاکانی خۆمان کە فەلەکی کۆنیان بە دەرس دەخوێند و دەگوتەوە تەواوێك لە دەست حیکایەتی ( ئەرز لەسەر پشتی گایە . . ) بەتەنگ دەهاتن و لە موناسەبەی دینی عادەتیدا ناچار بوون وەك خەڵقیدیکە پێشیدا دەهاتنەوە و وتووێژی فەلەکناسانەیان هەر لە ئالقەی خۆیاندا دەکرد چونکە چی ئەوان لە زانستی فەلەك باسیان دەکرد شتێك نەبوو بچێتە فامی نەخوێندووانەوە . حاڵ گەیشتە ڕادەیەك مەلایەکی مەغریبی دانی بە کافر بوونی ( شیخ محمد عبده ) دا داهێنا لەبەر ئەو جۆرە ڕایانەی کە یەکێکیان بزووتن و خڕ بوونی زەوی بوو . بە هەمە حاڵ ئەم شێوە پان و ئەستووکییەی زەوی بوو وای کرد هەندێ بابای پیتۆڵ چیای قاف بە ڕۆخاوڕۆخی ئەستووکەکەدا هەڵنێ نەوەك کەس سەرەتاتکە لە لێواریەوە بکات وەیا بکاتە پێکدا دووراني ئاسمان و زەوی و دەست لە کاری ناڕەوا بدات ، دێو و عیفریتی پشت چیای قافیش هەر بەرهەمی لابەلایی تەخت بوونی ڕووی زەوی بوو چونکە زۆر حەیفە ئەو مەڵبەندە کەسنەدیتوەی پشت چیای قاف بە بەتاڵی بمێنێتەوە لەکیس خوولیای ئاشقەدیۆو جنۆکەپەرست بچێت . سەبر لەوەدایە [ ڕەنگە سەیریشی تێدا نەبێ ] کە مێشکی مرۆڤ ئەفسانەی هەڵمشت و زاخاوەکەی بەخۆیەوە گرت بارتەقای ئەفسانەدۆستی شەڕ لەگەڵ ڕاستیدا دەکات و بەگژ بیری ڕووناك و پاکدا دێتەوە ، تەنانەت کە داهێنانە نوێیەکانی وەك تەلەفۆن و گرامەفۆن و فڕۆك هاتن و سەری ڕێیان بە هۆشی مرۆڤ گرت و تەنگیان بە ئەفسانە بابلیەکان هەڵچنی پاسەوانەکانی ئەفسانە بەکاری شەیتانیان دانان و لە خەڵقیان حەرام دەکردن ، دواتر نەختێك بە شەرم و تەوازوعەوە دەیانگوت ئەمانە هەموویان ( گاورکار )ن و عەقیدە تێك دەدەن ، تا ئێستاش مرۆڤی وەها هەیە لە پەرۆشی بێفێڵەوە دەسکێك بەڵگە بهێنێتەوە بۆ درۆزن بوونی چوونە ناو مانگ ، تاکو جارێکیان بە یەکێك لەوانەم گوت ئەدی ئەگەر پەلیان گرتیت و لە ناو کەشتییەکی ئاسمانگەڕیان دانایت و لە سەر مانگ دایانبەزاندیت ؟ گوتی ئەو دەمەش تەئویلێکی بۆ دەبینمەوە . لە ئاسیاوی خۆم کەسی وەهام دیتوە ، تۆش دیتۆتە ، کە شەوان کەشتی ئاسمانگەڕ وەك ئەستێرە بەناو ئەستێراندا دەگەڕا دەیگوت کوڕینە تەماشای مەکەن !! بۆ خۆشی چاوی دەبڕیە زەوی . .ئەویش و زۆریدیکەش شادی دایدەگرتن کە گەشتێکی ئاسمانی تێك دەچوو وەیا ئاسمانەوانێك تێدەچوو ، لەمەشدا هەر هێندەی ساوای نەفام گلەیییان دەچێتەوە سەر .

تەرکیبی زەوی سەرلەنوێ فێڵێکی گەورەی لە زانا کۆنەکان کرد کەوا بە ڕواڵەتی هەڵخەڵەتان و وایانزانی زەوی لە چوار ماکە مەشوورەکەی ( ئاو ، ئاگر ، خاك ، هەوا ، )پێك هاتوە کەچی ئێستا دەزانین هەر چواریان مادەی ئاوێتەی هەرەگرنگی زەوین . دۆزینەوەی ئەو چوار ماکەش بەرهەمی بیرکردنەوە و لێکدانەوەی زاناکان بوو نەك هەڵپەی مەیلی ئەفسانە وەیا ڕوانینی سافیلکە . ئەفسانەپەرست و سافیلکە بەعادەت بەرانبەر دیمەنی نامەفهوومی سروشت یا هەر دەحەپەسێ و یەکسەر بۆ غەیبی دەباتەوە ، یا لە ئاستیدا بێباك و بێ وردبوونەوە دەبێت ، بەتایبەتی ئەو شتانەی هەمیشە دەیانبینێت ، تا ئەو دەمەی کە خەریك بوونی بە ژیان و گوزەرانەوە لە شتانی هەڵدەنەنگوێنێت ئیتر حیسابێکیان بۆ دەکات . سافیلکە دەزانێ ئاو لە خۆڵ سووکترە ، هەست

به هەواش دەکات ، دیارە ئاگریشی دیتوە : بەڵام ئەو لێکدانەوە مەبلەو وردە ناکات کە هەرچی لە سەر زەوی بەرچا وو بەرهەستە یەکێکە لەو چوار شتە ، بۆ ئەم مامڵەتە نیمچە ( تجریدی )یە لەگەڵ سروشتدا گوێ لە مامۆستاکەی دەگرێ ، هەتا ڕاگەیاندنەکانی مامۆستاکەشی سادە تر بێ لێی خۆشتر دێت : دنیا بێ وردکردنەوە مەخلووقی خوا بێ خۆشترە لەوەی ئاو و ئاگر و خاك و هەوا بێ ، چواریش بێ لە نەوەد خۆشترە . تۆ لە سافیلکە بگەڕێ : ڕابەرە موژدەدەرەکانی ئەو چوار ماکە چەندین حیسابی زانستییان لەسەر جیهانی ( چوارماکی ) هەڵستاندوە، تەنانەت میزاجی مرۆڤیان بە پێی نزیك بوونی لە خاسیەتی هەر کامێك لەو چوارە بە چوار جۆر دابەشی کردوە دەرمانی نەخۆشییان بە پێی میزاجی نەخۆشەکە ساز داوە .

دیاردەیەکی هەمیشەیی‌دیکەی زەوی هەیە هەموو چاوێك دەیبینێت و هەتا سەردەمی ( نیووتن )یش بە داخراوی لە شێوەی تەپکەی فکر مایەوە فێڵی گەورەشی لێ‌کردین : هەرچی قورسایی هەیە بەرەو نزمایی دەبێتەوە . ئەم دیاردە بەڕواڵەت بەدیهی و سارەتایی‌یە وای لە نیگای زانا و نەزان کرد بۆ ئەوە بچێ کە ( ژووروو ) هەتا سەرووی هەرەسەرەوە هەر بەرز بێت و ( خواروو )ش هەتا تەختی بنی دنیا هەر نزم بێت . ئنجا کە ئەمەی لێ بوو بە باوەڕی بنجی ، بەڵکەی هەرەگەورەی تەخت و ڕاست بوونی ڕووی زەوی لێ داتاشی بەو گوتەیەی کە ئەگەر زەوی خڕ بێ لە پێشەوە هەرچی ئاو هەیە دەڕژێتە بۆشایی ژێرەوەی زەوی ، هەرچی شتی ڕەقیش هەیە لە تەنیشتەکان و دیوی بنەوەی زەوی ئەوانیش بەردەبنەوە بۆ بۆشایی نزم . چ فەلاتێکە ئەو خڕاییەی زەندیقەکان بە مل زەویدا دەبڕن ! خڕی چی و ماشێنەی چی !! ( زاناکانی یۆنان و فەلەکناسەکانی فێرگەی بەتلەمیۆس لەو حیسابە بەدەرن ) . من سافیلکەی وەهام دیتوە کە دەگوترا زەوی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە گورج قسەکەی بە درۆ دەخستەوە بەوەدا کە ئەگەر خولابایەوە دەبوو سبەینان کە لە خەو هەڵدەستا سەری لە جێی پێی بێت و پێشی لە جێی سەری .

چاوبەستەکێی بوونەوەر ، ناوناوە ، بۆ تێوامڕامانی مادەتی بەلای سیحر و تەلەسمدا دەچێتەوە وەك کە کانیاوەکان هاوینان ساردن و زستانانیش هێندەی حەمام هەڵمیان لێ‌هەڵدەستێ و خەڵق خۆیانی تێدا دەشۆن . هەر لەپەنا ئەم تەڵەیەدا یەکێکی‌دیکە هەیە ئەویش بەلای نیگای سادەوە چ تەفسیرێکی ژیربێژانەی نییە کە دەبینن هەتا پیاو بەرەو بەرزایی سەرووی شاخەکان تێ‌هەڵکشێت ساردترە هەرچەند لە ڕۆژیش نێزیکتر دەبێتەوە . ئەم دیاردەیە وای کرد بەر لە چەند صەد ساڵێك ( ابن خلدون ) بڵێ گەرمانی ڕۆژ دوای گەیشتنی تیشکەکەی بۆ سەر زەوی و عەکس بوونەوەی ئنجا پەیدا دەبێ . بەڕاستی ئەو جۆرە دیاردانە کە لە ڕواڵەتدا دژی بەدیهییەن و بەر هیچ سادە حیسابێکی مەفهووم ناکەون وەك پلانگێڕی بە ئانقەست سەرپۆشی پەنامەکیەتی بەسەر هەڵکەوت و بوونەوەردا دادەنەوە، هیچ گۆشەیەکی پەردەکەش دیار نییە پەنجەی هۆشتی لێ گیر بکەیت و هەڵی بدەیتەوە : ئاخر ئەگەر کاری جنۆکە و مێردە زمە نەبێ چۆن زستانان هەڵم لە کانیاوی سارد هەڵدەستێ ؟ نزیك بوونەوە لە ڕۆژ ساردایی پەیدا دەکات ؟ ئاگر لە ئاوی باران بەردەبێ ؟ ئەم پرسیارانە و صەدانی‌وەك ئەوان بۆ مرۆڤی نەخوێندووی بەر لە هەزار ساڵ و دووهەزار ساڵ برای سیحر و جادووگەری بوون و خورجینەی ئەفسانەی میراتییان دەئاخنی و ڕێیان بە مرۆڤی فێڵباز دەدا بە ناو تاریکایی هەر یەکێك لەو پرسیانەدا بۆ دەروون و گیرفانی سافیلکان خشکە بکات .

دیمەن و دیاردەی‌دیکە زۆرن کە لە هیچ کەلێنێکەوە هۆش و گۆشی مرۆڤی نەخوێندوو تێی بڕ ناکات و بەرانبەری دەحەپەسێ . لەمانە دوو دیاردە زۆر سەیر و نامەفهوومەکەی برووسکە و پەلکەزێڕینەن : ئەگەر لە غەیبەوە هۆیەکی ڕەق بزوێن بۆ برووسکە و یەکێکی نەشمیلانە بۆ پەلکەزێڕینە پەیدا نەکرێ ئەو خەڵقە سافیلکە و سادەیە دەبێ هەر دەمەبەشەکەی سەرسوڕمانی پێوە بێت . خوێندەواریش لە کۆنی کۆنەوە هۆی ڕاستینەی ئەم دوو دیاردەیەی نەدەزانی ، ڕەنگە تا ئێستاکەش بە تەواوی ڕوون نەبووبێتەوە بۆچی هەوری فشەڵۆك دەتوانێ بروسکەی ۲۰ کیلۆمەتری بەرپا بکات کەچی گەورەترین ڕشتەی کارەباسازی ناتوانێ لە چەند مەترێك دوورتر کارەبا بەهەوادا زاگوێزێ ، واتە برووسکەی مرۆڤ کرد هەزاریەکی بروسکەی

سروشت کرد دەرناچێ ؟ لەمەش بگەڕێ ، ئەدی چۆن تاکە گەواڵەیەك هەور هەر دەڕوات و بە درێژایی هەزار کیلۆمەتر لێشاوکەی وێرانکەر هەڵدەڕێژێ خۆ ئەگەر هەموو هەورەکە هەڵگوشیت صەدیەکی ئەو ئاوەی لێ پەیدا نابێ ؟ لەوەڵامی ئەم لایەنە ، کە جارێ نازانین چییە ، بیر لەو دەریایە بکەوە کە لە کۆنەوە خەڵقی نەخوێندەوار وایان دەزانی بە ئاسمانەوەیە و لەسەر شتێکی وەك بێژنگ ڕاوەستاوە کە کونەکانی کرانەوە دڵۆپەکان هەڵدەڕژێن .. ! ئەم خەیاڵەیان دەکرد هەرچەند لە عەقیدەشیاندا ، کە قورئانە ، باسی باران بەڕوونی کراوە نە بەحر و نەبێژنگیشی تێدایە . پەلکەزێڕینە لە بارانیش سەرنجڕاکێشتر و سەرسوڕێنترە . من تا ئێستاش لە بارەیەوە هەر ئەوەندەم خوێندۆتەوە و خوێندوە کە دڵۆپی باران شێوەی (منشور ) ڕەنگەکانی تیشکی ڕۆژ دەشکێنێتەوە لەوە بەولاوە چ تەفسیرێکم بەدەستەوە نییە لەوەدا کە چۆن ڕەنگەکان وەها پان دەبن کە لە دوورەوە بدیترێن چونکە ئەو تەفسیرەی من خوێندومە هەر ئەوەندەم تێدەگەیەنی کە ڕەنگەکانی تاکە یەك زنجیرەی دڵۆپە باران بەر بیبیلەی چاوم دەکەون ، ئەو ڕەنگی لە زنجیرەی سەرووتر وەیا خوارووتر دەشکێتەوە لە بیلبیلەی چاو بەرزووورتر وەیا بەرزێرتر دەوەستێ ، خۆ ئەگەر وا دابنێین هەر ڕەنگە لە ڕیزە دڵۆپێکەوە عەکس دەبێتەوە ئەوساش حەوت زنجیرەی دڵۆپە باران بەسەریەکەو هەر هێندەی خەتێکی باریك خۆ دەنوێنن ، وەهاش لەیەکدی نزیك دەبن کە سەرلەنوێ تێکەڵ بەیەکدی ببنەوە و بگەڕێنەوە بۆ شکڵی تیشکی ڕۆژ ، کەچی وەها دەبێ ، ناوناوە ، پەڵە هەورێك لە دوورایی پازدە کیلۆمەترەوە هەمووی دەبێتە پەلکە زێڕینە ، ئنجا ناشزانم بۆچی بەزۆری دووپەلکە زێڕینە هەڵدێن : یەکی زۆر گەش لە ژێرەوە یەکێکی کزیش لەسەرەوەتر! هەڵبەت ئەم پرسیارانەم نامکەن بە ئەفسانەپەرست چونکە سەرپێچیم لە ئەسڵی تەفسیرەکە نییە کە دەڵێ مەنشوورەکانی دڵۆپە بلران ڕەنگەکانی تیشکی ڕۆژ دەدەنەوە ، من هەر ئەوەندە دەڵێم کە تەفسیرەکە ، جارێ ، بایی هەموو دیاردەکە ناکات . هەرچی ئەفسانە پەرستە لە پێشەوە پەنا بۆ دێو و پەری و قەمچی فلانە پاڵەوان و کەزی فلانە فرشتە دەبات . ئەو فسانەشم لەلای خۆمەوە ترنجاندە ناو نووسینەکەم

بۆ ئەوەی باشتر دەرکەوێ کە چەند زەحمەتە مرۆڤ لە ڕێی خوێندنیشەوە بە ڕاستییە بنجییەکانی دیاردەی سروشت بگات ، ئنجا دەبێ حاڵی مامباپیری گوندی ( دەوژان )ی بەر لە ( ٥٠٠ ) ساڵ چی بووبێت !! ئەوەی ڕاستیش بێ زۆری خوێندەوارەکانی ئەم سەردەمەش لە لایەن تەسلیم بوون بەوەی پێی دەڵێن تەفسیری عیلمی هێندەی ئەو مامباپیرە خۆش جڵەون هەر بۆیەشە لە ئاست گۆڕانی هیچ تەفسیرێکی عیلمی ناکەونە ڕەخنەکارییەوە و بڵێن چۆن دەشێ کە فلانە شت تا دوێنێ بەڕاست دادەندرا ئێستا دەرکەوێ هەڵەی ڕووت بێ ؟ بەهەمە حاڵ بادەدەمەوە سەر ڕچەی نووسینەکە .

وەرزێری وڵاتی کوردەواری لە تەجرەبەی خۆیدا هەستی بەوە کردوە کە بای شەماڵ هەرچەند لە لەشی مرۆڤ خۆش دێت نەخۆشی شیناوردی وەك شۆکە و تۆی پێوەیە ، ڕەشەباش ، بەپێچەوانە ، لە لەش ناخۆش دێت بەڵام نەخۆشی شیناوردی پێوە نییە ، بگرە نەخۆشیش دەپەڕێنێ . ئەم دیاردەیە لە هیچ ڕۆشنە و کەلەبەرێکەوە تەفسیر بەدەست وەرزێری سادەی بێسەوادەوە نادات ، ئەویش ناچار هانای بردە بەر ئەرشیفی بیروباوەڕی میراتی و گوتی هەرچی ڕەشەبایە بای بەهەشتە بەسەر جەهەنەمدا تێدەپەڕێ ، شەماڵیش بای جەهەنەمە بەسەر بەهەشتدا دێت . سەیر لەوەدایە کە هێشتا ئەم بنۆس‌کارییە [ تفسیر ، تعلیل ] خاوێنترە لەوەی نەفەسی ئەژدەها و ورشەی باڵی پەری وەیا هاتوباتی پشت چیای قاف تێکەڵ بە مەسەلەکە بکرێ چونکە هەرنەبێ بەهەشت و جەهەنەم لە ئایینی بێفێڵ و بێتەئویلدا هەن هەرچەند چ دەخلیشیان بەسەر شۆکە و دۆوە نەبێ . خەڵق فێڵێکی بچووکی‌دیکەش لە خۆیان دەکەن لەوەدا کە هەرجارە لە نکاو سەرمایەك دێت و دەبینن بەفر لە شاخان باریوە گورج دەڵێن سەرمایەکە هی بەفرەکە بوو کەچی ، بەپێچەوانە ، بەفرەکە هی سەرمایەکەیە . کاتێك سەرما هی بەفر دەبێ کە بێین لەلاوە بەفر بهێنین و بەسەر شاخانیەوە بڵاو بکەینەوە و وڵاتی پێ فێنك بکەین . ئەم سەهوە بچووکە ئەگەر زەرەری نەبێ سوودیشی نییە ڕاست کردنەوەشی زەرەری تێدا نییە ، جگە لەوە کە لەوە ڕاهاتنمان بە سەلماندنی سەهووی بچووك لە کاری گرنگیشدا بەلای بنۆس‌کاری چەوتماندا

دەبابەتەوە وەیا هەر نەبێ فێری چاوپۆشی دەبین لە هەڵەی گەورەش . ئەوەی ڕاستیش بێ گەلێك باوەڕی چەوتی زێدە گرنگ و بە ئەرك لە بنەڕەتدا لە سەر هەڵەیەکی فکری بچووك هەڵستاوە ، وردە وردە تەنیوەتیەوە و ڕەگی داکوتاوە ، مرۆڤیش بە تێکڕایی زوو دەسخەڵەت دەدرێ تا ئەوەی مەشوورەکەی ( عەقلی لە چاویدایە )ی لێ بەڕاست دەگەڕێ لەو ڕووەوە کە ئەوەی چاو دەیبینێت بەڕواڵەت دیمەنی راستەقینەی شتانە وەك کە پێست سەرپۆشی ڕاستەقینەی لەشە ، هەر بۆیەشە پیاوی فێڵباز هەمیشە بە جۆری سەرنجڕاکێش و لە باری نائاسایبدا خۆی بە خەڵق نیشان دەدات . بڕوا دەکەم ئەگەر ساحیری نێوان هیندییە سوورەکان خەتی سەوز و شین بە سەر ڕوویاندا نەکێشن کەسی ئەوتۆیان بەدوا ناکەوێ ، وەیا گەورەترین سەرکردەی شەڕ لە حەمامدا بێ تاج و ئەستێرە و قایش و قرووش کەس سلی لێ ناکاتەوە .

گومان لەوەدا نییە کە ئەم جیهانە هەزاران هەزار تەپکەی فکری ناوەتەوە ئیتر سروشتکرد بێ وەیا مرۆڤکرد ، لەوەتەی فکری ڕوونیش خەباتی دەست پێ کردوە هەر خەریکی ئاشکرا کردنی ئەو فروفێڵەبوە کە لەو تەپکانەوە دزەی بۆ ناو مێشك و دەروونی ئادەمی کردوە و نرخی قورسی لێ‌ستاندوە ، زۆر جاران خۆکوژیشی پێ کردوە .

بێ ئەوەی من بڵێم لەخۆوە دیارە ئەرکی ڕەواندنەوەی تاریکایی تەپلەی فکر دەچێتە ئەستۆی ڕۆشنبیر چونکە ئەو وێڕای زیدە توانای تێگەیشتن و وردبوونەوە کە بە خوێندن پێی‌گەیشتوە هەر خۆیشی خۆی بەرابەر و چاوساغ و قوماندان داناوە. بەلای منەوە ڕابەرایەتی و پێشەوایەتی ڕۆشنبیر لە مەیدانی فکردا سێ مەرجی بنجی گەورەی پێوەیە :

**١ ـ لەسەریەتی بە درێژایی عومری ڕۆشنبیرایەتی خۆی خەریکی وەدەست هێنان و پترکردنی زانیار ( معرفە ) بێت و شانبەشانی قافڵەی بەرەو پێش چووی فکر و ئەدەب و هونەر و کۆمەلایەتی هەنگاو هەڵێنێ تاکو هەمیشە چاوی بە هەموو لایەکدا بنۆڕێت و لە ڕەشکەوپێشکەی** تێوە ڕامانی تاکە قوژبن ڕەها بێت . لێرەدا دەبێ بڵێم پەرۆش بۆ بیروباوەڕی شەخسی داوا لە ڕۆشنبیری دەکا کە خۆی بە هەموو چەکێکی فکری ئاراستە بکا نەك تاکە چەکی باوەڕی خۆی کە وا ڕەنگە هەر بەقەدەر کولە خەنجەرەکەی باوەڕی ناحەزەکەی بڕشتی هەبێ . زانست و هونەر ئەدەب و تەکنیك لەم سەردەمەدا وەها خێرا بوە ئەگەر لێی لەلینگان نەکەیتە دەنگ تۆزیشی ناشکێنیت. کتێبێکی بێ نلوو نیشانی ئەورووپا دەخوێنیتەوە سەرت سوڕ دەمێنێ لەو هەموو ورد ـ پێوی و قووڵ داگرتن و بەرفرموانییەی کە لە باسێکی وەها ، بە زاهیر ، کەم بایەخدا بەکار هاتوە . من ناڵێم ڕۆشنبیر مەیدانە تایبەتیەکەی خۆی چۆڵ بکا بۆ گەشتی ناو مەیدانەکانی‌دیکە : من دەڵێم وێڕای پسپۆڕ بوون لە مەیدانی خۆیدا دەبێ ئاگاداری هاتوباتی مەیدانەکانی‌دیکەش بێ بەتایبەتی ئەوانەی لە هی خۆی نزیکن هەر نەبێ بەنیازی ئەوەی خۆی پێیان دەوڵەمەندتر بکا و بشتوانێ لە کاتی پێویستدا لە چاوبەستەکێی حیلەگەری ئەو مەیدانانە ڕزگار بێ و ڕیشی خۆی تەسلیم بە غەیر نەکا . من لە تەجرەبەی خۆمدا شتی وەهام دیتوە بمهاوێتە سەر گومان کردن لە بڕیاری پسپۆڕان ، بە نموونە لە تەلەفزیۆنی وڵاتێکی ئەورووپا دیتم کێبەرکێ لە نێوان گۆرانی ( ١٨ ) دەوڵەتدا دەکرا ، هەر گۆرانییەك لە لایەن تاقمە پسپۆڕی غەیری خاوەن گۆرانیەکەوە نومرەی دەدرایێ ، بەزۆری وەها دەبوو گۆرانییەك لە لایەن پسپۆڕێکەوە (١٠٠) نومرەی بۆ دادەندرا لە لای یەکێکی‌دیکەشەوە ( ٠ )ی دەدرایێ . ئنجا کە حاڵی پسپۆڕ وەهابی با بێین کوێر و کەڕ بکەینە حەکەم وەیا تیروشکێ و خەتوشێرانێ بەکار بهێنین خۆ هەتا سەهوو بکرێ لە نێوان ( صەد و صفر )تێپەڕ ناکات .

ئەم مەرجەیان لە مەیدانی فکر [ ئەدەب ، هونەر ، فەلسەفە .. ] بەسەنگە مەیدانی زانست و تەکنیك مەگەر فەلسەفەیان لەسەر هەڵنرێ ئەخۆ ڕۆشنبیری فکر هاتوچۆیان تێدا ناکات .

**٢ ـ پێویستە ڕۆشنبیر ئەوە بە چاوی خۆیەوە بگرێ کە مومکینە خۆیشی وەك خەڵقی‌دیکە بە تەپکەی فکرەوە بوو‌بێت ، بۆیە لەسەریەتی هەمیشە بە بینین و باوەڕ و هەڵوەستی خۆیدا بێتەوەو تاقییان بکاتەوە ئەوەك بەدزیەوە هەڵەیان تێ‌خزابێت . ئێمە دەبێ بزانین ، مرۆڤ بەعادەت لەگەڵ قەناعەت و بیروڕای خۆیدا دەگونجێت و پێی دەحەسێتەوە ، هەرکە لێشی بەگومان کەوت ، کوردی گوتەنی ، کێچ دەکەوێتە**

**کەولییەوە . هەر ئەو حەسانەوەی گونجان لەگەڵ قەناعەتە وای کردوە باوەڕی پووچەڵ بۆ ماوەی هەزار و دوو هەزار ساڵ لەگەڵ کۆمەڵی دواکەوتوودا بژیت چونکە بەهیچ مامۆستایەکی فێڵباز و جادووگەر ناکرێ هەزاران هەزار مریدی سادە بهاوێتە سەر ڕێبازێك کە هەمووی زەرەر بێت ئەگەر لێیان خۆش نەیەت . تۆ سەیری ڕابەری دڵسۆز بکە ، چ عەزابێك دەخوا بە دەست** ئیقناع کردنی سافیلکان لەو ڕێنمایەیەی کە هەمووی پاکی و چاکە و بەرزەوەندە ئنجا بە هەزاری یەکێکیش بە دوا قسەکانی ناکەوێ . لە دەوروبەری خۆمان دڵسۆزێکی وەکو حاجی قادر بەر لە (١١٥) ساڵێك وەختا بوو بکوژرێ بە دەستی ئەو مریدانەی بە ئەرك و مەسرەفی خۆیان خزمەتی وڕێنەکانی شێخی ماوڵییان دەکرد . دواتر ، لە ئەستەمبۆڵەوە ، حاجی بە بیر خەڵقەکەی دەهێنایەوە کە دەیگوت :

**لە دەوری گەرنەبی تا دەوری گای کوێر**
**لە گوێی گا نوستوون زۆر حەیفە بۆ شێر**

بەهەمە حاڵ مرۆڤ کە باوەڕێکی بە دڵدا چوو ، با هەڵەی ڕووت و ڕەجاڵیش بێ ، وەهای بۆ دێتە جۆش خۆی تێدا لەبیر دەکات ، ڕۆشنبیریش مرۆڤە و فرشتە نییە ، گەلێك جارانیش پتر لە سافیلکان شێتگیرە دەبێ بۆ باوەڕێکی قرپۆك وەیا هەڵوەستێکی پووچ . جا ئەگەر خۆی ڕانەهێنێ بەوەی ناوناوە چاو بە هەڵوەست و قەناعەتیدا بگێڕێتەوە کەڵکی ڕابەرایەتی پێوە نامێنێ .

مەرجی سێیەم کە تەواوکەری مەرجی دوەمە ، ئەوەیە کە پێویستە مەیدانی ڕەخنەگرتنی دڵسۆزانەی بێنیاز لە بەر فکر و نۆڕیندا بەربەرەڵلا بێ و ڕۆشنبیری لێ وەتەنگ نەیەت هەرچەند ڕەخنەکە ڕوو لە خۆی و باوەڕیشی بکات . فکر و ئەدەب و زانست و هونەر و داهێنان و بەرهەم هێنان و گەشتی بن دەریا و فڕینی ئاسمانان هەمووی لە پێناو خزمەتی ئادەمیزاددا شەرەف پەیدا دەکەن ، کە هات و یەکێك لەمانە ژووروی مرۆڤ خرا و لێی کرا بە بوت لە خانەی شەرەفی مرۆڤ دۆستی لا دەچێت بۆ خانەی مرۆڤ نەویستی . لە سەردەمی گەشەی ژیاری عەباسیەکاندا دەوری حەفتا باوەڕی سەر بە تاکە ئایینی ئیسلام وێکڕا دەژیان و هەرەشە لە هیچیان نەدەکرا ، بە سەرنج گرتنیش لەو باوەڕانە و کارێکی کردوویانە دەردەکەوێ بەرژەوەندی گشتی لێیان زەرەرمەند نەدەبوو . خەڵق لە ڕێی باوەڕەوە بەخەگیری یەکدی نەدەبوون تەنانەت مەسیحی و جوولەکە و زەردەشتی و هی‌دیکەش لە پەراوێزی باوەڕدا پێکەوەیان هەڵدەکرد . بێ‌گومان گەشەی ژیار ـ[ حضارە ]ی عەباسیەکان قەرزداری ئازادی باوەڕە نەخۆ ئەگەر دەنگی ئەدیب و خاوەن فکر و زاناکان خەفە کرابایە دەریا دەریای کتێبان کووچە و بازاڕی بەغدا و شارەکانی دیکەی ئەوسای ئیسلامیان پڕ نەدەکرد ، ئیسلامەتیش ئەوە نەدەبوو ئێستا مسلمان و عەرەب شانازی پێوە بکەن . بەلای منەوە ڕێدان بە ڕەخنە گرتن جێی سەرپێچی و نەسەلماندن نییە ، ئەوەی دەشێ لە بارەی چەندوچۆنی ڕەخنە گرتنەوە قسەی لێ بکرێ شێوەی ڕەخنە گرتن و دەربڕینی باوەڕە ، لێرەدا خاوێنی زمان و دڵ و قەڵەم پێش مافی ڕەخنە گرتن دەکەونەوە چونکە بە هیچ مەزهەبان ڕەوا نییە ( ماف ) ببێتە هەلی تێچێن کردنی نیازی بەد و وشەی بێ‌حوورمەت . بێ‌گومان جۆری ڕەخنەکاری نێوان ڕۆشنبیران و شێوەی ڕەخنە گرتن و وەرام دانەوە پێوانەی هەرەڕاستە بۆ ئەزموونی پلەی پەسەندایەتی و سوودبەخشایەتی ئەو هێندە ڕۆشنبیریەی کە مافی ڕەخنەگرتنی تێدا تاقی دەکرێتەوە . هەتا ڕێکاری ( ڕەخنە و وەرام ) بەرزتر بێت پتر بەڵگە بە دەستەوە دەدات لەسەر سوودبەخشی و جوامێری کارەکە و هەموو سەروبەرێکی ڕۆشنبیری و خوێندەواری ڕەخنەگر و وەرامدەرەوەکان .

ئەم نووسینە لەوانە نییە کۆتایی بێت چونکە هەتا بە دووی بکەویت شریتە درێژ دەکاتەوە : هەرچی بوونەوەر هەیە بە سروشت و مرۆڤیەوە دەشێ خورد بکرێتەوە بۆ تەپکەی فکری بچووك و گەورە کە هەر یەکێکیان ڕۆژێك لە ڕۆژان فامی مرۆڤی بە هەڵە بردبێ تا ئەواڕادەیەی تاریکایی گەیاندبێتە بیروباوەڕ و پێوانەی چاکە و خراپە کە سەیری ڕەوتی مێژووش بکەیت دەبینیت هەموو هەنگاوێکی بەرەوپێشەوەی مرۆڤ بە دوو قاچی ئیعتباری هەڵنراوە : یەکێکیان دۆزینەوەی هێندێك ڕاستی ، دوەمیشیان پووچاندنەوەی هێندێك هەڵە ، ئنجا وەهاش بوە ئەو ڕاستییەی دوێنێ چرای کۆمەڵایەتی بوە ، بێ‌ئەوەی باری ئابووری وەیا ڕۆشنبیری گۆڕابێ ،

ورده ورده [ لەبەر ئەو هۆیانەی کە لێرەدا جێی باس کردنیان نابێتەوە ] تاریکایی داوەتەوە و سەرلەنوێ خەباتی تازە بابەتی بە مل دڵسۆز و مێشك ڕوونەکان دابڕیوە .

ناچارم واز لە شریتەی نووسینەکە دەهێنم تاکو ماوەم بمێنێ بۆ ئەوەی تەپکەیەکی فکری زۆر بە ناوبانگ بدەمە بەر نیگای خوێنەر و مافی ڕەخنە گرتنی تێدا بەکار بهێنم . ئەم تەپکەیان وەك هەر ئێستا ڕوون دەبێتەوە فێڵی لە زاناکان کردوە لە ڕێی ئەوانیشەوە قوتابیەکانیان پابەندی بوون ، منیش کەدیم ڕەخنەی لێدەگرم هونەرەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە لە سەرەتاوە بیری وەهای کردوە من بە خۆیەوە خەریك بکات :

لە شیکردنەوەی مێژوو کە بە سەر ڕاڕەوی مادی مێژوییدا دەڕوات عەبدایەتی بە قۆناخی مێژوویی دانراوە وەك دەرەبەگایەتیوسەرمایەداری. بە پێی بۆچوویی من کە لە بەر تیشکی مادی مێژوویدا سەیری پرسیارەکە دەکەم عەبدایەتی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە نەك قۆناخی مێژوویی چونکە لەو نەزەریەدا ئەوەی سیفەتی (قۆناخ) بە پلیکانەیەکی مێژوو دەبەخشێت لایەنی ئابووری و جۆری ( بەرهەم هێنان ) ە واتە دەبێ ( قۆناخ ) زادەی عەمەلیەتی گۆڕانی ئابووری بێت و ڕووداوێکی مێژوویی و ناچاری بە ئابووریەوە بەستراو بێت وەك کە فەلاح و ملکدار لە بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی سەردەمێکدا لە شێوەی حەتمی پەیدا دەبن ، هەرچی عەبدایەتیە زادەی عەمەلیەتی بەرهەم هێنان نییە ، بەچکەی ڕاستەوخۆ و یەکسەری ئابووریش نییە ، بەڵکو بە زۆری لە ئاکامی دۆڕاندنی شەڕدا دانیشتوان وەیا عەسکەرەکانی وڵاتە تێشکاوەکە بە دیل گیراون و بوونەتە عەبد ، وەیا لەبەر ناگزووری خەڵف منداڵی خۆیان فروشتوە ، ڕەنگە خۆشیانیان فرۆشتبێ . منداڵ فرۆشتن بەوەندە نابێتە بنچەی پەیدابوونی ( قۆناخی بەئابووریەوە بەستراو ) کە فرۆشتنی تێدایە چونکە مەڕ و گیسك و عەلیشیش و کەڵەشێریش دەفرۆشرێن چ قۆناخانیش دروست ناکەن . حاڵ و باری منداڵ فرۆشتن و مەڕ فرۆشتن پێوەندی بە جۆری بەرهەم هێنان و هۆی بەرهەم هێنانەوە نییە ، مامڵەتێکە دەشێ شانبەشانی چەندین قۆناخ بەردەوام بێت ، ڕەنگ بوو ئەگەر یاسا مرۆڤ فرۆشتنی مەنع نەکردبایە ئێستاش لە هەندێ شوێنی ڕووت و برسی و دواکەوتوودا هەر لە برەو بوایە ، لە برەویشدایە . راستییەکەی ، لە وڵاتی خۆمان تا ئەو لە برەو بوایە ، لە برەویشدایە راستییەکەی لە وڵاتی خۆمان تا ئەو نزیکانەش وەها بوە منداڵ فرۆشراوە بەڵام نەبیستراوە قانوون نە لە کۆن و نە لە نوێدا سەلماندبێتی .

چی لێرەدا گوتم لە بارەی قۆناخ نەبوونی عەبدایەتی بەوەندە هەڵناوەشێتەوە کە لە پایتەخت و شارە گەورەکانی دەوڵەتە زلە کۆنەکاندا لە ئاکامی شەڕی بەردەوام و سەرکەوتوو ، هەزاران عەبد و جاریە لە ژێرووی هەموو چینەکانەوە کۆمەڵەیەکی دەسبەسەر و بێماف و بێمزەیان لێ پەیدا بوە و شێوەی ( چین ) یان وەرگرتوە چونکە قسەمان لەگەڵ ( قۆناخ )ە ، جا ئەگەر ناوی قۆناخت لەسەر هەڵگرت با لە شێوەی ( دیاردە )دا هەر ناوێکی پێدەدرێ بدرێ بەهەمەحاڵ ئەو عەبدانەی پارە و پوولیان چنگ کەوتوە خۆیانیان کڕیوەتەوە و ئازاد بوون، لەوانەیشە لە شەڕێکیدیکەدا کۆنە عەبدەکە خاوەنەکەی خۆی بە دیل گرتبێ و کردبێتیە عەبد . هیچ دوور مەبینە یەکێك عەبدی ئازاد کردبێ و دواتر خۆی هەژار بووبێت و کۆنە عەبدەکەی کڕیبێتی . تۆ ناتوانیت وا بە قسە ( فەلاح ) ڕەها بکەیت وەك کە بە قسە عەبدێك ئازاد دەکەیت ، کرێکاریش بە قسە نابێتە ماڵدار وەیا ئاغا کەچی دەشێ هەر لە شێوەی عەبدایەتیدا عەبد فەلاح بێ وەیا سەرباز بێ وەیا بازرگان بێ واش بوە بۆتە (سلطان) ێکی وەك کافووری ئیخشیدی . عەبدایەتی بەقەدەر ( بوتپەرستی ) دیاردەیە و هەردوویان بە بەریانەوە هەیە پێکەوە شانبەشانی چەند قۆناخ بە مێژوودا سەرەژێر ببنەوە . هەردووشیان ( چۆنیەتی )ن و بەبڕیار و بە قسە بەردەوام دەبن یاخود هەڵدەوەشێنەوە .

ئەو بیریارەی دیاردەی عەبدایەتی بە قۆناخ دانا بەر تەپکەی لێکدانەوە و وردپێوی خۆیەوە بوو کە دیتی لە ڕوویەڕەکانی مێژوودا دیمەنی هەزاران هەزار عەبد لە شکڵی ڕیزە بەردی دیوار چینێکی هەرەژێرووی قەڵافەتی کۆمەڵایەتی پێك دێنێ ئیتر بۆچی پێی نەگوترێ چین ؟ کە کڕین و فرۆشتنیشی بەسەرەوە بێ بۆچی قۆناخی مێژوویی نەبێ ؟ لە ڕاستیدا عەبد وەك ( قوتابی ) و ( عەسکەر ) چەند

خاسیەتێك لەوەی دادەبڕێ قۆناخ بێ :

**١ ـ عەبد و قوتابی و عەسکەر هەرەمەی هەموو چینەکانن بگرە لە شازادەوە تا هەژاری ڕووت و برسی .**

**٢ ـ زادەی یەکسەر و ڕاستەوخۆی بەرهەم هێنان نین بەڵکو پێداویستێکی چاك وەیا بەدی کۆمەڵایەتین ، ئەو پێداویستە پێوەندی بە ئابوورییەوە هەبێ یا نەبێ .**

**٣ ـ دەشێ هاوعومری زوربەی قۆناخە مێژووییەکان بن هەرچەند لەلایەن سەرەتای پەیدا بوونەوە عەبد و عەسکەر کۆنترن لە قوتابی ، عەسکەر و قوتابیش پیتر دەوام دەکەن ، ڕەنگە قوتابیش بەردەوامتر بێ لە عەسکەر .**

**٤ ـ هەروەك قوتابیەتی و عەسکەری حالەتێکی کاتییە بۆ تاکەکانیان دەشێ عەبدایەتیش بۆ تاکە عەبد کاتی بێت بە هۆی ئازاد کردن وەیا خۆکڕینەوە وەیا هەڵاتن بۆ جێی دوورەدەست وەیا بە دەرچوونی یاسای ئازادکردنی عەبد وەیا مردنی خاوەنەکانی ..**

هەڵبەت گەلێك دروشمی جودا کەرەوەش هەیە لە نێوان ئەو سێ تاقمەدا وەك ئەوەی کە عەسکەر نابێ بەسنوورە ، قوتابیش لە چاو عەبد عومری تایبەتی هەیە کەمتریش خێزان پێك دێنێت ...

دەتوانین لە قوتابییەوە بەڵگەیەکی بەهێز وەرگرین بۆ ڕوونتر کردنەوەی لایەنی قۆناخ نەبوونی عەبدایەتی قوتابی بە پێی بەرەوپێش چوونی کۆمەڵایەتی گەیشتە پلەیەك کە ژمارەی بەقەدەر تێکرای کرێکار و فەلاح بێت . لە زۆر وڵاتی پێشکەوتوودا چواریەکی کۆمەڵ قوتابین ، بگرە نیسبەتەکە لەوەش تێپەڕ دەکات چونکە زوربەی هەرمزۆری هەموو ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان شەش ساڵ و بیست ساڵدایە قوتابین . خۆ ئەگەر ئەو ساوایانەی جارێ نەگەیشتوونە تەمەنی خوێندن لە حیسابەکە دەرهاوێژین ژمارەی قوتابییان خۆی لە نیوەی ژمارەی هەموو دەخشێنێت . دەرهاویشتنی ساوایانیش لەوەوە دێت کە ئەوان جارێ لە ئالقەی هیچ بەرپرسیدا نین ئەرکێکی پێوە بێ و ناوێکی لێ بندرێ ئەوە نەبێ کە خۆیان ئەرکن بەسەر شانی غەیرەوە یەکەم پلەی بەرپر سیشیان قوتابیەتییە جارانیش وا دەبوو دەبوونە شاگرد . بە هەمە حاڵ ڕۆژمك دێت هەرچی پێ لە کۆڕی ژیان بنێت بێتە قوتابی لەگەڵ ئەمەشدا کەس ناڵێ قوتابیەتی قۆناخە چونکە بە پێی تێکبەسترانی ( قۆناخ ) بە ( ئابووری و بەرهەمهێنان ) ەوە قوتابیەتی سیفەتی قۆناخی نابێت هەرچەند خۆیشی سەرچاوەی ئەو کەسب و کاروانە دەبێ کە قۆناح و چین پێك دێنن . ڕەنگە نەزەریە پەیدا ببێ حیسابێکی تازە بۆ قوتابی بکات و ژووررووی چینەکان و قۆناخەکانی بخاتەوە بەڵام ئێمە قسەمان لەگەڵ ڕاڕەوی مادی مێژوویی‌یە کە لەوێدا مەرجەکانی قۆناخ [ هی‌چینیش ] لە قوتابیدا نایەنەجێ هەروەك لە عەبدیشدا نایەنەجێ . قوتابیەتی پێوەندی بە ئابووری و گوزەران و بەرهەم هێنانەوە نییە هەرچەند زۆر جاران شوێن پەنجە لە کارەساتی ڕامیاری زێدە گرنگیش دادەنێ چ جایی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری .

لە عەسکەر و قوتابی هەڵکشیین بۆ ( موظف ) کە دەزانین ١ ـ کار دەکات ٢ ـ مەعاش‌خۆرە ٣ ـ بەر پرسە ٤ ـ کاریگەرە ٥ ـ ناوی ( چین ) هەڵدەگرێ ، ئنجا پێی ناگوترێ قۆناخ چونکە بەڕاستی دیاردە و پێداویستی کۆمەڵە نەك قۆناخی مێژوویی ئەگەر هاتبا ( موظف ) دوو مەرجی لێ هاتبایە دی منداڵ بێ ، بە زۆریش مێرینەیە ، ژمارەشی دەبوو بە قۆناخ :

**مەرجی یەکەم : پێوەندی ڕاستەوخۆی بە بەرهەم هێنان و ئابوورییەوە هەبوایە .**

**مەرجی دوەم : ئەویش وەك ئەو چینانەی بە دوا یەکدیدا دێن شتێکی‌دیکەی زادەی هەناوی خۆی بە دوا خۆیدا هێنابایە وەك کە سۆشیالیزم بە دوا سەرمایەداریدا دێت و لەویش دەکەوێتەوە .**

عەبدایەتی بارتەقای سەرباز و قوتابی و موەزەفە کەهیچیان زادەی قۆناخ نین و دایکی قۆناخ نین و خۆشیان قۆناخ نین : لە هەموو حاڵاندا دیاردەی کۆمەڵایەتییە بەڵام هێندەی قوتابی و موەزەف حەتمی و ناچاری نییە چونکە دەشێ لە کۆمەڵدا عەبد هەر پەیدا نەبێ وەك کە نەبیستراوە لە کوردەواریدا عەبدایەتی هێندە هەبووبێ کە سەرنج ڕاکێشێت وەیا پێی بگوترێ چین .

**بەهەمەحاڵ ئەگەر عەبدایەتی دیاردە بێت و بەس کار ناکاتە سەر هیچ سەروبەرێکی ناوەرۆکی نەزەریەکە هەرچەند کەمێك لە چۆنایەتی ڕوخساری دەگۆڕی ئەویش هەر بابی جوداوازی عینوانی (قۆناخ) لە عینوانی (دیاردە) بەسەر فۆرنەیەکی نەزەریەکەوە.**

# ئامرازی ( ـ ە ) خستنە سەر و چەند روونکردنەوەیەکی زمانەوانی

د. کوردستان موکریانی

**پێشەکی**

ئەم بابەتە زمانەوانی‌یە بەشێکە لەو لێکۆڵینەوەیەم ، کە لەژێر نێوی ( ئامرازەکانی خستنە سەر لە زمانی کوردی ) دایە وە لە گۆڤاری زانکۆ ، ژمارە ـ ١ ، بەرگی ـ ٤ ، ساڵی ١٩٧٨ دا چاپکراوە.

لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە ئەم بەشە بڵاودەکەمەوە : ـ

یەکەم ـ گرنگی و کەم باس‌کردنی ئەرکی رێزمانی ئەم ئامرازە .

دووەم ـ ئەم بەشە . وەك کەرەستەیەك بێت بۆ پەراوێزەکان ، کە سێ بەشی ئەم وتارەم دەگرێتەوە ، کە بۆ راست کردنەوەو روون‌کردنەوەی ئەو بیرو را سەرپێی‌یانە تەرخان‌کراوە ، کە دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف دەربارەی ئەم ئامرازەی لە ژمارە (٧٠)ی ساڵی (١٩٧٨)ی رۆشنبیری نوێدا بڵاوی کردۆتەوە وە لە دوا بەرهەمیشیدا ( رێزمانی کوردی ) دووبارەی‌کردۆتەوە .

**ئامرازی ( ـ ە )ی خستنە سەر**

ئامرازی خستنە سەری ( ـ ە ) وەکو ئامرازی ( ـ ی ، ـ ێ ) .... (١) دیارخەرو دیارخراو بە یەکەوە دەبەستێت وە دەوری خستنەسەرو دانەپاڵ دەگێرێ .

ئامرازی خستنە سەری ( ـ ە ) لەنێو زمانە ئێرانیکاندا تەنێ لە زمانی کوردی‌دا بەدی دەکرێت . ئەمەش تایبەتێتی زمانی کوردی لە ئامرازەکانی خستنەسەردا دەردەخا .

زمانەوانانی کوردناسی رۆژئاواو زمانەوانانی کورد لە بەرهەمەکانیاندا لەگەڵ ئەوەی بە دەگمەن باسی ئەم ئامرازەیان کردووە ، ئەو تاك‌و تەرایەی پەنجەیان بۆ راکێشاوە چەندین بیروڕایان دەربارەی نێونان‌و رۆڵی مۆرفۆلۆژی‌و کاتی پەیدا بوون‌و بەکارهێنانی ئەم ئامرازە هەیە ، بۆ وێنە :

مامۆستا د. ن. مەکەنزی لەو باوەرەدایە ، کەوا ( ـ ە ) ئامرازێکە بۆ پێك‌هێنانی ووشەی لێکدراوی‌ئاوەڵە ( open kommound ) ،...(٢)

مامۆستایان جەمال‌جەلال‌و ئی . مەکارۆس لەبەرهەمەکەیاندا باسی رۆلی مۆرفۆلۆژی ئامرازی ( ـ ە ) یان کردووە ... (٣) . مامۆستایانی نێوبراو لەو باوەرەدان ، کەوا ئەم ئامرازە تەنێ لەو کاتەدا بەکار دێت ، کە دیارخەر ( attributive ) ناسراو بێت . بەواتە نیشانەی ناسیاری ( ـ ەکە )ی پێوە لکاوبێت هەروا لەو بارەشدا ، کە جێ‌نێوی نیشانە ( ئەم و ئەو ) بکەونە پێش دیارخراوەوە ( dependenb member ) وە تەواوکەرەکەیان بە دیارخەرەوە بلکێ لەشێوەی ( ئەو ... ە ) ، ( ئەم ... ە ) دا ، بەڵام ئەوەی لێکۆڵینەوە بۆمی‌روون کردۆتەوە ئەوەیە ، کە ئامرازی خستنە سەر (ـ ە)وە نەبێ هەر لەم دوو دۆخانەی سەرەوەدا بەدی بکرێ، بەڵکو لە هێندێ باری دیشدا بە دیار دەکەوێ ، کە تا ئێستا هیچ نووسەرێکی کوردقامکی بۆ رانەکێشاوە .

لە ووشەی لێکدراوی دیارخەری خستنە سەردا ، کە بەهۆی ئامرازی ( ـ ە ) پێك دێت ، دیارخراو هەمیشە کۆتایی بەخاڵ دێت ( مەبەست لە ووشەی کۆتایی هاتوو بەخاڵ ئەو ووشەیەیە ، کە هیچ نیشانەیەکی رێزمانی پێوە نەلکابێت ، وەك نیشانەی ناسیاری نەنەسیاری .. )

**١ ـ دیارخە رکۆتایی بەخاڵ دێ ، بۆ وێنە :**

کورە لادێ‌ی کەمێك بیری کردەوە ( ١٠ چیرۆك ، ٨٤ ) بەم شێوەیە شاعیری گەورەی کورد عبداللە گۆران رووی گوفتار ئەکاتە کچە کورد .. ( رۆشنبیری نوێ ، ژمارە ٥٨ ـ ٥٩ ، ل ـ ٦٠ )

**٢ ـ دیارخەر کۆتایی بە نیشانەی ناسیاری ئاد**

**( ـەكە ) وە كە لەگەڵ نیشانەی كۆدا دەبێ ( ـەكان ) دێ . ئەم دۆخە لەچاو دۆخەكانی دی زۆرتر بەكار دێت :**

مەگەر هەر دۆستە دڵخوازەكەی زەمانی كورێنیم
لە پێشەنگی سەرقافڵەكەی جوانتر بوایە . ( هەمیشە بەهار ـ ٦٠ )

ژنە دڵسۆزەكەی لەپە ساوارێكی گەلێك بەتامی
بۆ لێنابوو ( كڵاٚفەیەك ژانی توورە ـ ٦٦ )

چاوە قاوەیەكانی وەك شێت دەرپەری ( سمكۆڵی ئەهریمەن ـ ١٩ )

منیش خۆم وا دەرخست ، كە ئاگاداری قسە پچرپچڕەكانی ئەو نیم ( گەردەلوول ـ ٣١ )

**٢ ـ دیارخەر كۆتایی بە نیشانەی نەناسیاری ( ـ یك ) دی ١٠٠؟ بۆ وێنە :**

كورە پاشایەكی چینی بۆچی سەبارەت بەشیرینی هەرمەنی لە كوردستانێدا كێوان هەڵ دەكەنێ ؟ ( شیرین و فەرهاد ، ١٢ )

كۆمەڵە شاخێك سەخت و گەردن كەش
ئاسمانی شینی گرتۆتە .. باوەش ( گۆران )

**٤ ـ دیارخەر كۆتایی بە ( ـ ە )ێ ، تەواوكەر وەیا پاشبەندی جێ‌سێوی نیشانەیە ، ( ئەو ) بۆ دوور ، ( ئەم ) بۆ نێزیك .**

جێ نێوی نیشانەو پاشبەندەكەی لەگەڵ ووشەی لێكدراوی دیارخەری خستنە سەردا بەم شێوەیە دەبێ : ( ئەو ... ە ) ، ( ئەم ... ە ) ، بۆ وێنە ... (٥)

عیسا هاو دەنگەكانی خۆی كۆكردەوەو چوونە سەر ئەو دژمنە بەهێزە (مێژووی میرانی سۆران ـ ٤)

پێشكەش بۆ : ئەو گیانە پیرۆزانەی لە پیناوی هونەری جوانا فرمێسك و ئارەقەی زۆریان رشتوە ( فرمێسك و هونەر )

ئەم هەستیارە پایەبەرزە بەهۆی فێربوونی ئەو زمانەوە دەروازەی هەموو جۆرە هونەرێكی وێژەیی بە جارێكی لەسەر كرابۆوە ( دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری ـ ٦ )

لێرەدا پێویستە ئەمە روونبكرێتەوە ، كەوا ئەم ئامرازە لە شێوەی كرمانجی ژووروشدا لەم دۆخەی لەسەرەوە باسكراودا بە دی دەكرێ ، بۆ وێنە :

**ئەف چیرۆكە ئاشكارە لەهەر چار كەنارێت كوردستانێ بەهەمی زاراڤێت كوردی هەیە ( مەم و زین ، ٢٠٨ )**

**پەراوێزو سەرچاوە :**

١ ـ بۆ روونكردنەوەی ئەركی رێزمانی ئامرازی ( ـ ی ) خستنە سەر تەماشای لێكۆڵینەوەكەم بكەن ، كە بە نێوی ( ئامرازەكانی خستنەسەر لە زمانی كوردیدا )یە ، لە گۆڤاری زانكۆ ، ژمارە ـ ١ ـ ، بەرگی ـ ٤ ـ ، ١٩٧٨دا بڵاوكراوەتەوە وە بەم جۆرە باسی ( ـ ێ )م لەلاپەرە ( ١٥٩ )ی گۆڤاری نێوبراودا كردووە :

[ لە هێندێك لەو هەرێمانەی ، كە بە شێوەی كرمانجی خواروو دەدوێن ، وەك كۆیێ ، دەشتی هەولێرێ ، رەواندزێ و بنگردێ ئەم ئامرازە بەكاردێت ، هەروا لەنێو دەقی فۆلكلۆریدا ئەم نیشانەیە فرەیە ، بۆ وێنە :

**دەچمە مارێ خارم**
**ئایشەگوڵ خوشكێ بابمە**
**ئەورۆ زەینێ خۆ بدەنێ قەنتەرەی ماڵێ بابێ حەیرانی ...**
**( كۆمەڵێك لاوك و حەیران ـ ١٠٦ ) ]**

هەروا لەپەراوێزی لاپەرە ( ٥٦ و ٥٧ )دا لەنامەی دكتۆراكەمدا بەوێنە باسی ئامرازی ( ـ ێ )م كردووەو لەگەڵ كرمانجی ژووروودا بەراوردم كردووە . هۆی نەبوونیشی لە كورتەی نامەی دكتۆراكەمدا یەكەم : لەبەر ئەوەیە نامەكە خۆی كورتەو شوێنی باسكردنی هەموو باسێكیووردی تێدا نابێتەوە ، دووەم : نامەكەم وە نەبێ بە تایبەت لەسەر ئامرازی ( ـ ێ ) خستنە سەر بێت ، كە بە نەبوونی لەوێدا بەهەڵەیەكی گەورەی زمانەوانی بدرێتە قەڵەم و لەلاپەرە ( ٢٢٢ )ی ( رێزمانی كوردی )دا د. ئەورحمان بڵێت :

[ لە هەندێ ناوچەی سۆراندا نیشانەی ( ـ ێ )ش ئیزافە ساز دەكا . وەك :

**بابی شەماڵ ئاگا گیرە**
**لەسەر سینگی ئەنووم تیرە**
**جێگەی سەرسوڕمانە ، كە د. كوردستان هەستی بەو تایبەتی‌یە ئاشكرایەی مەڵبەندەكەی خۆی نەكردووە ] .**

وەك لە كاتی بڵاوكردنەوەی بەرهەمەكانمدا دیارە من چەندین ساڵ پێش دكتۆر ئەورەحمان باسی ئامرازی ( ـ ێ ) خستنە سەرم كردووە وە هەستم بە رۆڵی رێزمانی كردووە لە مەڵبەندەكەی خۆمدا ، بەڵگەشم

ئەم دوو بەرهەمە ڕێزمانییانەی ژووروون ، کە بە وێنە بۆ خوێنەرانم هێناونەتەوە ، نەك بۆ دکتۆر ئەورەحمان ، چونکە دکتۆر بەر لە چاپدانی کتێبە ڕێزمانییەکەیدا بە ساڵێك چاوی بە لێکۆڵینەوەکەم کەوتووە ئاگاداری هەموو لایەنێکی بابەتەکە بووە .. بەڵگەشم بۆ ئەو راستییە ئەم ووتەیەی خۆیەتی ، کە لە لاپەرە ( ٣٢٦ )دا لە ڕێزمانی کوردی )دا دەڵێ :

( ئەم وتارەی لەم دواییەدا د. کوردستانی موکریانی بەناوی « ئامرازەکانی خستنە سەر لە زمانی کوردیدا » وە لە ژمارە ١ی بەرگی ٤ی ساڵی ١٩٧٨ی گۆڤاری زانکۆدا بڵاوکردەوە بە داخەوە فریای ئەوە نەکەوت لەم نووسینەماندا لێی بدوێین . جا هیوامانە لە هەلێکی دیدا بیروڕامان سەبارەت بەو کارەش دەربرین ) .

ئایا دەبێ ڕاست بێ د. ئەورەحمان بەماوەی یەك ساڵ فریای لێ دووانی ئەم لێکۆڵینەوەیەم نەکەوتبێ . ؟ ! وەیا بە لێ نەدووان لێی مەبەستێکی دی هەبووبێ .. ؟

٢ ـ بروانە د. ن. مەکەنزی ، دیراسەتی دیالێکتەکانی کوردی ، بەرگی ١ ، لەندەن ، ١٩٦١ ، ٦٤ .

٣ ـ جەمال جەلال و ی. مەکاروس ، بنچینەی دیالێکتی کوردی لە سلێمانی ، مەشیگان ، ١٩٦٧ ، ١٢١

٤ ـ د. ئەورەحمان دەربارەی بوون و نەبوونی نیشانەی ( ـ ێك ) لەمبارەدا لەنێو کورتەی نامەی دکتۆرێکەمدا لەلاپەرە ( ٢٢٥ )ی بەرهەمەکەی خۆیدا، کە ( ڕێزمانیکوردی )یە نووسیویەتی :

( د. کوردستان بۆ ئەوە چووە ، کە لە حاڵەتی ئیزافەدا بە یاریدەی نیشانەی ( ـ ە ) پێکهاتوودا ، ئەگەر دیارخەر ئاوەڵناو بێ ، دەتوانێ نیشانەی ( ـ ەکە )ی ناسیاوی تاك و ( ـ ەکان )ی نیشانەی ناسیاوی کۆ وجێناوی نیشاندان و ( ـ ە ) نیشانەی ناسیاوی « ل ١٣ » وەربگرێ .

کەچی دەرکی بەوە نەکردووە ، کە لەحاڵەتی ناوبراودا دیارخەر دەتوانێ نیشانەی نەناسیاویش وەر بگرێ ، بە وێنە :

**کچە کوردێك دڵ پێی شاد بێ**
**وەك فریشتە پەریزاد بێ ( گۆران ، ب ، ل ـ ٣٥ )**

ئەز بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە دروستکراوە بەم جۆرە وەرامم دەدەمەوە :

**یەکەم :** لەمخاڵەدا نەنوسراوە گەر دیارخەر ئاوەڵناو بێ ، بەڵکو گەر دیارخەر ناو بێ ، بروانە ، کورتەی نامەی دکتۆراکەم ، ل ـ ١٣ ، دێری سێیەم . ـ

**دووەم :** ئەم تێبینییە دکتۆر ئەورەحمان خۆی بۆ منی دروست کردووە ، چونکە من لە شوێنی خۆیدا بەواتا لە لاپەرە ( ١٣ )ی کورتەی نامەی دکتۆراکەمدا باسی ئەو دۆخەم کردووە ، کە د. ئەورەحمان دەڵێ کوردستان دەرکی پێ نەکردووە. وە ئەم رستەیەی خوارەوەشم بە وێنەی بەڵگە هێناوەتەوە ، جا نازانم بۆ دکتۆر ئەورەحمان دەڵێ کوردستان دەرکی پێنەکردووە ! ؟ !

وێنەکە :

ڕۆژێکی مەلا لەراوێدا پۆلە مراوییەکی لە گۆمێکیدا دەبینێ ( کورتەی نامەی دکتۆراکەم ، ل ـ ١٣ ) .

**سێیەم :** بەڵگەی سێیەم لەبوونی ئەم نیشانەیەدا لەشوێنی خۆیدا د. ئەورەحمان خۆیەتی .

د. ئەورەحمان لە لاپەرە (٢٢٤)ی بەرهەمەکەیدا بەم جۆرە پەردە لەسەر تێبنییەکەی خۆی هەڵدەداتەوە دەڵێ :

« دیسان نووسەر ( کە مەبەستی منە ) تەنیا ( ـ ەك ) بە نیشانەی نەناسیاوی داناوە ، کەچی ئەو ڕستەیەی پاش دێریك بۆ سەلماندنی ڕاکەی هێناوەتەوە ( ڕۆژێکی مەلا لە راویدا پۆلە مراوییەکی لە گۆمێکیدا دەبینێ ) دەبینین ( ڕێك ) تێیدا نیشانەی نەناسیاوییە . . . ل ـ ١٣»

ئەم ڕەخنەیەی د. ئەورەحمان ئەوە دەسەلمێنێ، کەوا من لەلاپەرە ( ١٣ )دا نیشانەی نەناسیاریم لەگەڵ دیارخەردا هێناوەتەوە لەکاتێکدا ، کە ئامرازی خستنە سەر ( ـ ە )یە .

بۆ نووسینی نیشانەی نەناسیاری بە ( ـ ەك ) نەك ( ـ ێك ) دەڵێم :

لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا وە زۆربەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی خواروودا بۆ باری نەناسیاری نیشانەی ( ـ ەك ) بەکاردێت . منیش بۆ مەبەستی یەکگرتن و یەکخستنی نیشانەکە لە برێتی ( ـ ێك ) ( ـ ەك )م نووسیوە . کە ئەمەشیان لەرووی بزوێن و نەبزوێنی کۆتایی ئەو ووشەیەی ، کە پێوەی دەلکێت دەگۆری و لە شێوەی ـێك و ـیەك دا

دەبێ ، هەر وەکو لەم وێنەیەدا بەرچاو دەکەوێ ( پوڵە مراویێك )وەیا ( پوڵە مراوی‌یەك ) .

٥ ـ دەربارەی شوێنی ئەو ( ـ ە )یەی ، کە تەواوکەر وەیا پاشبەندی جێناوی نیشانە ، ( ئەم ) و ( ئەو ) دکتۆر ئەورەحمان دەڵێ :

[ ئەو ( ـ ە )یە بە دیارخراوەوە دەلکێ نەك بە دیارخەرەوە کەچی نووسەر ( کە مەبەستی منە ) وای داناوە ، کە دەچێتە سەر دیارخەر ، بروانە : د. ئەورەحمان ، رێزمانی کوردی ل. ٢٢٤ ) ] .

بە بەڵگەی زمانەوانی دووپاتی دەکەمەوە ، کەوا ئەو ( ە )یەی ، کە پاشبەندی جێنێوی نیشانەی ( ئەم )و ( ئەو )ە بە دیارخەرەوە دەلکێ . بۆ وێنە :

**( منداڵی زیرەك ) ووشەیەکی لێکدراوی دیارخەری‌یە منداڵی زیرەك هات . رستەیەکی سادەی فرەیە .**

لەم رستەیەی سەرەوەدا ، کە جێنێوی نیشانەو پاشبەندەکەی ( ئەو ... ە ) ی لەگەڵ بەکار دێت لەم شێوەیەدا دەبێ :

ئەو منداڵە زیرەکە هات .

لەم رستەیەی ژووروودا ( زیرەك ) دیارخەرە .

ئەو ( ـ ە )ی پێوەی لکاوە پاشبەندی جێنێوەکەیە .

( منداڵ ) نێوی دیارخراوە ، ( ـ ە )ی ، کە پێوەی لکاوە ئامرازی خستنە سەرە .

« ئەو کابرایە ئاسنگەرە هاورێی منە »

ئەم رستەیەی ژووروروم لەنێو نامەی دکتۆراکەمدا بە بەڵگە هێناوەتەوە بۆ روونکردنەوەی ئەرکی ئامرازی خستنە سەری ( ـ ە ) . با بزانین دکتۆر ئەورەحمان بەرامبەر ئەم رستەیە دەڵێ چی ؟ !

( ئەو (ـە)یەی بە دوای وشەی «کابرایە»دا هاتووە بەر لە هەموو شتێك ، بێ ئەویش رستەکە ساز دەبێ واتە دەتواندرێ بوترێ ( ئەو کابرا ئاسنگەرە هاورێی منە ) .

بەڵێ دکتۆر ئەورەحمان هەتا ئێرە راستە ، بەڵام لەبەر ئەوەی من باسی (ـە) خستنەسەر دەکەم هەر دەبێ باسی ئەو بارەیان بکەم ، کە (ـە)ی پێوە دەلکێ ، نەك ئەو بارەی تۆ باسی دەکەیت .

د. ئەورەحمان لە هەڵسەنگاندنی ئەم رستەیەدا بەردەوام دەبێ و دەڵێ :

[ ـ جگە لەوە ئەگەر نووسەر مەبەستی لە (ـە)ی کۆتایی وشەی (کابرایە) بێ ئەوە نەك لە حاڵەتی ئیزافەدا بەڵکو لە حاڵەتی تریشدا هەر جێناوەکە تەواو دەکات وەك کە دەگوترێ . ( ئەو کابرایە رۆیشت ) . لێرەدا هیچ ئیزافەش لە گۆڕێ نی‌یە . ]

هەر وەکو لە نامەی دکتۆراکەمدا گوتوومە (ـە)ی پاشبەندی ( ئەو ) بە دیارخەرەوە دەلکێ ، لە کاتێکدا ، کە باسی ووشەی لێکدراوی دیارخەری دەکەم ، کە ئەویش « کابرای ئاسنگەر »ە .

دکتۆر ئەورەحمان لەم باسەدا بەردەوام دەبێ و دەنووسێ :

( خۆ ئەگەر مەبەستی د. کوردستان (ـە) کۆتایی وشەی « ئاسنگەرە » بێت ، ئەوە لەوێشدا هەر تەواوکەری جێناوی نیشاندانە جا بێتو هێز لەسەر ووشەی ئاسنگەرە دابنرێ ، ئەوە دەبێتە خەبەرو (ـە)ش دەبێتە کرداری بێ‌هێز . لەم حاڵەتەدا لەدوا وشەی « ئاسنگەرە »وە دەبێ فاریزە دابنرێ . )

بەڵێ مەبەستی من (ـە)ی کۆتایی وشەی « ئاسنگەرە » هەر وەکو لەپێشوودا روونم کردۆتەوە .

لێرەدا هیچ هێزێك لەسەر ئاسنگەر نی‌یە ، چونکە رستەی ( ئەو کابرایە ئاسنگەرە هاورێی منە ) رستەیەکی سادەیە ، پێویستیشی بە فاریزە نی‌یە ، چونکە فاریزە لە رستەی لێکدراو و تێکەڵدا دادەندرێ، هەروەکو دیارە ئەم رستەیە تاکە رستەیەکەو سادەیە ، بۆیە بە هیچ شێوەیەك ناتوانی فاریزەی بۆ دانییت .

ئاسانترین رێ بۆ سەلماندنی ئەوەی ئەو (ـە)ی بە کۆتایی ووشەی (کابرا)ی رستەی ( ئەو کابرایە ئاسنگەرە هاورێی منە )دا لکاوە ، ئامرازی خستنەسەرە لابردنی (ئەو....ە)یە لە رستەدا ، کە بەم شێوەیە دەمێنێتەوە :

کابرای ئاسنگەر هاورێی منە .

لێرەدا ئامرازی (ـی) خستنە سەر یەکسەر شوێنی ئامرازی (ـە)ی خستنە سەری گرتەوەو پێویستی بە هیچ روونکردنەوەیەکی‌تر ناکات ، چونکە ئەم شی کردنەوەیەی ژووروو راسترین رێگەی لێکۆڵینەوەی زمانەوانی‌یەو ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ ، کەوا ئەو (ـە)ی بە کابراوە لکاوە ئامرازی خستنە سەرە هەروەکو من لە نامەی دکتۆراکەمدا باسم کردبوو وە لەم ووتارەشدا بە بەڵگەی رێزمانی روونم کردەوە .

# ئەو بابەتە تازانەی بەزمان دراوون

## ١ ـ گرنگی زمان :

یەکەم جار کە منداڵی تازە لە دایك دەبێت ، چاوی بە ڕووناکیەك دەکەوێت ، دەبینین هاوار دەکاتو ئەم هاوارەش بەڵگەی ژیانو هاتنە دنیای ئەو منداڵەیە، هەر کاتێك ئەو منداڵە هەستی کرد بە برسێتی یا تەنگی ئەو جلەی کە لەبەریدایە ، یان دەرزیەك کە لەو بەرۆیانە دراوەو لەشی پێ داپۆشراوە ، ئەوا هاوارەکە دووپات دەبێتەوە . وەپاش تێپەڕ بوونی چەند حەفتەیەك ، دەبینین ئەو منداڵە چەند دەنگێکی لێوە دەردێت ، کەمەرج نیە ئەو دەنگانە بەر گوێی کەوتبێت ، بەڵام زیادتر لەوە دەچێت کەئەو منداڵە بیەوێت دەنگە ژێ‌کانی رابهێنێت ، تا چەند دەنگێکی پێ دروست بکات کە لەکاتی قسەکردنی تەواوەتیدا ، هەندێکیان دیار نامێنن .

لە هەمان کاتیشدا ، دەیەوێت ئەو دەنگانە فێربێت کە لە دەورو بەریدا هەنو وردە وردە دەتوانێت دەنگە جیاکان کە لە چەند کەسێکەوە دێنەدەرێ ، وەئەو دەنگانەی کە تەنیا لە یەك کەسەوە دێنەدەرێ جیابکاتەوە ، وەك دەنگی دایکو بەمەش دەتوانێت دەنگی نەرمو بەسۆز لە هی تووڕەو تیژ لەیەکتری جیا بکاتەوەو ، بۆ هەریەکەیان ، بەشێوەیەکی جیاواز ، بەرەو پیریەوە بچێت(١) .

زۆرجار ، بەر لە تێپەڕ بوونی ساڵی یەکەم، ئەم منداڵە ، تاکە تاکە وشە لەدەمیەدە دێتە دەرێ ، وە لە ساڵی دوو هەمدا ، چەند دەنگێك دەرئەبڕێ کە بریتییە لە موفرەدات یان (رستە) کە نیشاندەری چەند شتێك یان چەند حەزو ئارەزوویەکی ئەومنداڵەن ، ئەم تاکانەش (مفردات) یان لەخەڵكو کەسانی دەوروبەری بیستوونی یان بۆیەکەم جار خۆی دەریان ئەبڕێت . بەڵام لەگەڵ بە سەرچوونو تەواو کردنی ساڵی دووهەمدا ، چەند رستەیەك دەردەبڕێت کە لە سەرەتاوە لەدوو وشە پێکدێنو دوایی ژمارەیان زیاد دەکات ، ئەمجا ناوی شتو مەك فێردەبێتو لە چەند رستەیەکی بەجێ دەچن . ئەم حاڵەتە هەتا ساڵی سێهەم دەخایەنێتو بەرە بەرە قسەکانی بەرەو ڕێكو پێکیو تەواوی دەچێتو لەوزمانە نزیك دەبێتەوە کە دەوروبەرەکەی قسەی پێ دەکەن . بەڵام لەساڵی چوارهەمدا ، دەتوانێت بە تەواوی ، پێویستیو ئارەزووی خۆی بەزمان ، واتە بەقسە کردن دەرببڕێت . دەتوانین بڵێین کە منالێ ئاسایی واتە (ساغ) هەر لە چوار ساڵیەوە دەبێتە خاوەنی زمانی خۆیی‌و تەنیا ئەوەی لەسەر دەمێنێت کە خوی رابهێنێت

لەسەر رستەی ئاڵۆزتر لە جاران ، لەو رستە ئاسانانەوە باز بداتە سەر رستەی کەمێك گرانترو تێکەڵتر ، هەتا دەگاتە قۆناغی لاوی‌و ئەمجا پیری‌و ، وەك هەموو کەسێکی دی ، بە شداری ژیانی گشتی دەکات‌و بە درێژایی ناتوانێت لە زمان بپچڕێت .

وەلەبەر ئەوەی کە هەر لە کاتی لە دایك بوونمانەوە ، پێویستمان بەزمانەو هەموو مرۆڤێکی سەرڕووی زەمین ، بەئاسانی ، بەزمانی نەتەوەکەی خۆی ئەدوی‌و لەسەر ئەوزمانە رادێت ، هەتا وا بهێنێتە پێش چاوی خۆی کە بەشێکە لەنەتەوەکەیی یان گۆڕانێکی ئاسایی ژیانە وەك نووستن‌و خواردن‌و رۆیشتن‌و .. وەلەبەر ئەوەی مرۆڤ ، بێ بیرکردنەوەیەکی زۆر ، لەژیانی رۆژانەیدا ، زمان بەکار دەهێنێت‌و وەك ئەو خەڵکە ، کە چۆن بەئاسایی وبەئاسانی بەکاری دەهێنن‌و قسەی پێ دەکەن . ئەمیش هەروەها بەکاری دەهێنێت ، دەبینین زۆر کەم بیر لەزمان دەکاتەوەو ئاوڕ لە بایەخی دەداتەوە ، ئەمە لەلایەك ؛ لە لایەکی دیکەشەوە دەڵێین مرۆڤ ، وەك بیر لە بەکارهێنانی زمان‌و بایەخەکەی ناکاتەوە بیر لەرادەی ئاڵۆزی‌و گرانیشی ناکاتەوە .

بەلام سەرەڕای ئەمانەش هەمووی ، وە تەنیا هەڵوەستێك‌و تێڕوانینێك بۆئەو ژیانەی ئێمە دەژین ، بە ئاشکرا بۆمان دەردەخات ، وەپتر لە هەموو کاتێکیش ، کە ئێمە لە سەردەمی وشەدا دەژین ، بە دەربڕاوی یان بەنووسراوی ، وەبەبێ زمان ئێمە ناتوانین بە هیچ جۆرێك لە کۆمەڵ دابژین ، ئێمە لە هەموو رووبەکی ژیانماندا ، زمان بەکار دێنین ، بۆ دەربڕینی هەستو ویستمان ، بۆ جێ بەجێ کردنی پێویستیەکانمان ، بۆ گەیاندنی هەواڵ‌و راگەیاندنی کارێك یان باسێك ، بۆ دان‌پیانان بەکردن‌و نەکردنی کارێك ، بۆ ئاهەنگ‌و بۆنەی کۆمەلایەتی‌و ئاینی ، بۆ ئەوەی جێگەی کارو رووداو بگرێتەوە ، بۆ رازی کردن‌و هاندان‌و تیژکردن ، بۆ پڕوپاگەلاندە کارکردنە سەر خەڵکی ، لە گۆرانی‌و سرودو هۆنراوەو خوتبەداندا ، بۆ رێك خستن‌و مەیسەر کردنی پەیوەندی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەلایەتی ، بۆ دەرخستن‌و دەربڕینی کەلەپووری میللی‌و وەبۆ هەوڵدان لەپێناوی چاك کردن‌و بەرەو پێش خستنی

* یوسف رؤوف *

کۆمەڵ یان تێکدانی کۆمەڵدا ، لەم هەموو بوارەدا ئێمە زمان بەکار دەهێنین ، سەرەڕای ئەوەی کە بەشێوەی نووسین . لە نووسینەوەی چەك‌و وەسیقەو پەیمان نامەو ئەدەب‌و زانست‌و هونەرو ئاین‌و یاسادا ، بەکاری دەهێنین‌و بەو شێوەیە ، ئەو کەلەپوورو وەسیقانەی لەنەوتاندن ، پێ ئەپارێزین‌و نەوە بەنەوە ، شتی زیادەی دەچێتە سەرو شارستانی ناو خۆو جیهانی پێ دروست دەکرێت .

هەر لەو کاتەوە کە مرۆڤ پەیدابووە . وەلەهەموو کات‌و شوێنێکدا وشە ، کارو بایەخی خۆی هەر بووەو ، پێشینان جۆرەها رێگای نوێیان داهێناوە بۆ پاراستنی ئەو شتانەی کە ویستوویانە بۆ نەوەی نوێ، یان جیهانێکی تر ، بیپارێزن ، بەو شێوە دەبینین (نووسین) هاتە کایەوە کەبەرهەمی داهێنانی ئەوانەی پێش ئێمەبەو ئەمجا ئامێرو ئامرازی نووسین‌و کەرەسەی جیاوازیش ، وردە وردە دروست بوون وەك پێویستی (نووسین) ، و بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆیان، بەکاریان دەهێنان ، کەلەوانە هەندێك لەو کەلەپوورە بەدەست ئێمە گەیشتووەو گرنگترینیشیان ، کەدەماو دەم یان بەنووسراوی پێمان گەیشتوە ، ئەو دەستوورە بەنرخ‌و بەرزانەیە کە ئاینەکان بۆیان دیاری کردووین .

بەلام هەتا لە سەدەی پازدەهەمدا ـ وەلە ئەورووپادا (چاپ) دانەهێنرا ، بایەخی زمان بەتەواوی دەرنەکەوتبوو . بێ‌گومان ، چاپیش رۆڵێکی گەورەی لە بلاوبوونەوەی زمانی نووسراودا بینی . هەروەك هەندێك دەڵێین کەچاپ گەورەترین شۆڕشە لەجیهانی زماندا کەبەر لەسەردەی بیست بەرپا بوو . ئێستەش ئێمە هەست بەگەورەترین شۆڕشێکی هونەری زانست دەکەین کە لەباس‌کردن بەدەرەو دەسکەوتەکانی پێشووی مرۆڤایەتی بە بەشێکی زۆر بچووك دەژمێردرێت لەم دەسکەوتە تازەیە . ( ئەو هۆیە تازانەی کەبۆپەیوەندی ) بە کاردێت ، هەر لە تەلەفون‌و بێ‌تەل‌و رادیۆو تەلەفیزۆن‌و سینەماو رۆژنامەو وشەی چاپکراوەوە ، وەهەر لەو هۆیانەی

کەدەبنە هۆی خەزن کردنی یان ( گل دانەوە )ی زانیاری وەك کۆمپیوتەرو ئامرازی وێنەگرتن‌و ... هتد . ئەمانە تێکرا ، ڕۆڵێکی وەها گرنگیان دابەووشە کە هیچ مرۆڤێك وە لەهیچ کۆمەڵێکی شارستانی‌دا ، نەتوانیت دەس بەرداری ببێت‌و لە هەموو هۆیەکی دیکە کاریگەرترو بایەخدار تربێت ، بەشێوەیەك ، کەلەوانەیە هەموو بیرکردنەوەو بڕواو تێگەیشتنمان بەرهەمی ئەو هۆیانە بێت . لێرەدا بەپێویستی دەزانین کە ڕاگەیاندن ( ئاشکرا کردنەو پڕپاگەندە )(٢) بە نموونە بهێنینەوە ، هەتا هێزو کاریگەری ئەم هۆیانە بزانین . هەروەك ئاشکرایە کەرادیۆ بووە هۆی ئەوەی کە جیهانی دەرەوە بگەیەنێت بە هەموو ماڵێك. دوا بەدوای ئەویش تەلەفیزۆن هاتە کایەوەو دەنگ‌و وێنەی لە هەموو قوژبن‌و لایەکی سەرزەویدا بە مرۆڤ گەیاند ، بۆ ئەوەی کە خوێندەواری‌و نەخوێندەواری گوێگر یان بینەر ڕۆڵێکی ئەوتۆ ببینێت ، سەبارەت بە گوێ‌گرتن یان بینین .

هەموومان ، ئەوە دێتەوە یادمان کە چۆن مرۆڤ پێی نایە سەر ڕووی مانگ‌و باسی ئەو شتانەیان دەکرد کە بەچاوی خۆیان دیویانە ، هەروەها دەزانین کەچۆن بارودۆخ‌و دیاردەی سەر مانگ ، بەهۆی ئامێرو جیهازەکانەوە ، پێمان ڕاگەیەنرا ، کە تا ئێستاش بەردەوام ، زانیاری چەند کەوکەبێکی دیکەمان پێ دەگات ، کە زۆر دوورن‌و بەهۆی ئەو جیهازانەوە . ئەو زانیاریانە دەبنە زمان‌و هەندێکی ، مرۆڤی ئاسایی لێی تێ دەگات‌و هەندێکی تەنیا پسپۆڕان لێی تێ دەگەن .

ئێستە هیچ وڵاتێك ، وەهیچ گەلێك ناتوانێت ، دوورو گۆشەنشین بژی لە وڵاتانی دی یان لەگەلانی دی کە لەسەر ڕووی زەمینن . جا ئەمە بەهۆی بەرژەوەندی تێکەڵەوە بێت یان بەیارمەتی هۆیە خێراکانی گواستنەوە بێت کە دەبینین هەستی پێ دەکەین . بۆ نموونە ، هەر ئەوەندە ڕووداوێکی گرنگ ڕوودەدات ، لە ماوەیەکی کەمدا ، بەهەموو جیهان دەگات‌و هەندێ جار دەبێتە هۆی جۆرەها ڕووداوی تری وەك تێکچوونی فەرمانڕەوای‌و هەڵگیرسانی شەڕوشۆڕو کوشتاری گەورە ، یان دەبێتە هۆی یارمەتیدان‌و هاوکاری کردن لەگەڵ وڵاتێکدا کە کارەساتێکی لێ ڕوودداوە ، چەندەها هەواڵ بڵاو بۆتەوە لە مەیدانی زانست‌و وەرزش‌و سیاسەت‌و ئابووریدا ، کە جۆرەها کاردانەوەو ئەنجامی چاك یان خراپی هەبووە ، بێ بەپێی چۆنیەتی هەواڵەکە .

جگە لەمانەش ، دەبینین هەر بەهۆی وشەوە ، لەم سەدەیەدا چەندەها کۆنگرەو کۆبوونەوەی ناوخۆو جیهانی‌و ڕێکخراوی نێوان وڵاتان بوونەتە دیاردەیەکی هەست پێ‌کراو ، بۆ نموونە ئاسایش‌و دەستەی نەتەوە یەك گرتووەکان ، کە ئەمانە ، تەنها بەهۆی وشەوە دەتوانن لەیەکتری بگەن . جگە لەوەی کە وشە بووەتە هۆی لەیەك تێ‌گەیشتن لەنێو گەلان‌و فەرمانڕەوایەکاندا .

ئێمە نامانەوێت پتر لەم باسەبدوێین ، چونکە مەسەلەی ڕۆڵی وشە یان زمان لەژیانی گەلێکدا یان چەند گەلێکدا شتێکی ئاشکراو ڕوونە ، بەڵام لەزمانی یەکێك لە لێکۆڵەرانەوە دەڵێین بەهۆی (تێنەگەیشتن) واتە تێنەگەیشتنی زمانەوە ، بۆمبایەکی ئەتۆمی لە شەشی‌ئابی ١٩٤٥دا ، درا بە شاری هیرۆشیمادا لە ژاپۆن چونکە وەك دەگێڕنەوە ، گوایە ئەمەریکا ، ژاپۆنی ئینزار کردووە بۆ شەڕوەستاندن‌و خۆبەدەستەوەدان ( بەزمانی خۆیان ) بەڵام ژاپۆن بەشێوەیەك وەڵامی داوەتەوە کە گوایە ئەوان لە چۆنیەتی ئینزارەکە ( دەکۆڵنەوە ) بەڵام وەرگێڕەکە بەشێوەیەکی کە ئەم وشەیەی وەرگێڕاوە کە مانای ئەوە دەبەخشێت کە ژاپۆنیەکان ئینزارەکەیان بەرپەرچ داوەتەوە ) ، ئەوە بوو ، بەهۆی ئەم خراپی تێگەیشتنەوە سەدەها هەزارکەس بوون بەقوربانی .

ئەمجا ئەم شتە ڕاستبێت یان (دروست کراو) گرنگ ئەوەیە بەهۆی هەڵەیەکی زمانەوانیەوە یان بەهۆی وشەیەکەوە کەمانایەکی دیکەی بەخشیوە لەفەرهەنگدا ، چەندە ڕووداوی تر ، ڕوویداوە ئەگەر لەم ئاستەش نزم‌تر بووبن ، بەڵام هەربەڵگەی ڕۆڵی وشەو زمانن .

**ماویەتی**

(١) بەرەو پیرەوە چوون بەواتای (استجابەی) عەرەبی
(٢) ئاشکرا کردن = بەرامبەر ( اعلان )

# کورتە هەڵسەنگاندنێکی کتێبی ڕێزمانی کوردی

صباح غالب

دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، مۆرفۆلۆژی ، بەشی یەکەم ، ناو ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، ٢٨٤ لاپەڕەی قەوارە بەتاڵ .

ئەم کتێبە برێتی‌یە لە پێشەکی‌و دوو بەش ، لە پێشەکی‌یەکەدا لە وشەی ڕێزمانو کاری ڕێزمان وەك زانستێك کۆڵراوەتەوەو سنوری ئەو زانستەی دیاری کردووە ، ئەوجـــا باوەڕی ــ یونانی‌یـــەکانو رووسەکانو ئینگلیزەکانو .. لە بارەی ڕێزمانەوە باس کردووە ، لە پاشاندا لە دابەشکردنی بە شەکانی ئاخاوتندا ئاوڕی لە زانا کوردەکان کە ڕێزمانیان بـە پێی زمانی رووسی‌و زمانی ئینگلیزی دابەش کردووە داوەتەوەو تێڕوانین‌و هەڵسەنگاندنی تایبەتی خۆشی لەو لایەنەوە روون کردۆتەوە.لەم بارەوە ئەگەر ئاگای لە کارەکانی مامۆستام دوکتۆر کەمال فوئادو مەکاوسی‌و مەکنزی ببوایە ، زانیاری تازەتری بۆ دەر دەکەوت .

جگە لەو دوو بەرەی زمانی رووسی‌و زمانی ئینگلیزی‌یان کردۆتە پێشەنگ ، زمانەوانی دیکـــەی کورد هەن کە سوودیان لە ڕێزمانی فارسی‌و عەرەبیش وەرگرتووە . چاکتر وابوو لەوانیش بدوایەو جۆری کەڵك وەرگرتنیانی دیاری بکردایە . ئەگەر چی لـە لاپەڕە (( ١٩ )) نۆزدەدا مامۆستا سەعیـــد صـــدقی دەخاتە ژێر تاوی ڕێزمانی عەرەبی‌یەوە . بەڵام تەنها دەست راکێشانەو هیچیتر .. هەر لە پێشەکی‌یەکەدا سروشتی وشەی کوردی بەسەر وشەی تەواو کـە برێتی‌یە لە (( ناو ، ئاوەڵناو ، جێ‌ناو ، ژمارە ، کردار ــ چاووگ ، ئاوەڵکردار )) ، وشەی ناتەواو کـــە برێتی‌یە لـە (( پرێپۆزیشـــن ، ئامرازی پەیوەنـدی ئامرازی ســـەرسوڕمان بانگهێشـــتن ، پارتیکڵ )) دابەش کردووە ، دواجار لە کۆتایی پێشەکی‌یەکەدا هاتۆتە سەر گوێزانەوەی هەندێ بەشە ئاخاوتن بۆ بەشـــێکی دی‌و بە نموونەو لێکدانەوەوە لێیان دواوە ، دوای پێشـــەکی دوو بەشی ســـەرەکی‌و فراوان دەبینرێن ، ئێمـــەش لەم نووســـینەدا لاپـــەڕەی (( گۆفارێکی کوردی )) چەندە ماوەمان بدا لەو کارەی دوکتۆر دەکۆڵینەوە .

لە بەشی یەکەمدا دوکتۆر زوربەی زۆری ئەو کارانەی لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی « ناو » دا کراون ، تەماشای کردوون‌و بەچاوی هەڵسەنگاندنەوە پێیاندا چۆتەوە ، لە زمانەوانە کوردەکان ، رووی گلەیی زۆری لە مامۆستایان سەعید صدقی‌و تۆفیق وەهبی‌یە کە بەلای هەندێ مەســـەلەدا نەچوون ، بێ‌گومان بـــۆ چوونەکەی دوکتۆر وەك زانست دروستە بەڵام بـــۆ ئەو کاتە پەلەیە ، چونکە پێشـــەکی دەبوایە ئـــەوەی بزاندایە کە ئەو دوو گەورە زمانەوانە هیچ میراتێکی زمانەوانییان لەبەر دەستاندا نەبووەو لە ســـفرەوە دەستیان پێ‌کردووە ، جگە لەوەش لە هەموو جیهاندا کاری زمانەوانی ئەوەندە پێشکەوتو نەبوو کە ئەوان بە

ئاسانی کۆلینەوەی زمانی کوردی‌یان بۆ مەیسەر بوو بێ ، دوکتۆریش ئەگەر ئەو کارانەی زمانەوانان‌و شارەزایانی پێش خۆی لەبەر چاواندا نەبوونایەو ئەو پێشکەوتنە گەورانەی لە جیهانی زانستی زماندا روویان داوە لە سالانی دوای « ۱۹۳۰ » یەوە ئاگای لێیان نەبوایە ئەوا رەنگ بوو ئەمیش لە هەولەکانی ئەوانی چاکتر پێشکەش نەکردایە .

**دوکتۆر لە هەلسەنگاندنی کارەکەی مامۆستا سەعید صدقی کابان‌داو بۆ پاشگری بچوککردنەوە هەندێك پاشگری دیکەی زیاد کردووەو دەڵێ « لە زمانی کوردیدا ژمارەیەکی تر پاشگر هەن کە بۆ بچووککردنەوەی ناو بەکار دەهێنرێن‌و نووسەر « سەعید صدقی ـ ص ۰ غ » ناوی نەبردوون ، وەك: یلە ـ ئەنگوستیلە ، وولە ـ مێشوولە ، ۆلە ـ کیژۆلە، چکە ـ گوێچکە ، لە ـ مێروولە ، چە ـ باخچە ، ۆلە ـ بەرخۆلە ، ۆل ـ ئاسکۆل ، وو ـ پووشوو ، یلکە ـ چاویلکە ... « ل ـ ۱۸ » .**

**هەموو ئەو پاشگرانەو لەوانیش پتر لە پێش دوکتۆرەوە باسکراون ، بۆ نموونە لە کتێبی گرتنی کەلێنێکی‌تر لە رێزمانی کوردی‌و کتێبی زمان‌و ئەدەبی کوردی قۆناغی ئامادەییدا هەن (۱) لە هەمان کاتدا ئەو نموونانەی کە بە ناوی پاشگری بچووککردنەوەوە هێناونی‌یەتەوە ، هەندێکیان پاشگرنین‌و بەشێکی لێك نەپچڕاوی وشە رەسەنەکەن .**

**دوکتۆر بۆ پاشگری بچووككردنەوە دەڵێ « بە زۆری بۆ بچووك کردنەوە یا گەیاندنی مانای نازداری بەکار دەهێنرێن ، بەلام هەندێکیان جگە لە واتای بچووککردنەوە ، مەبەستی‌کەش دەگەیەنن»(۲) دوای سێ سال بەسەر ئەو کتێبەدا لە رێزمانی کوردیشدا دەلێتەوە « بە زۆری بۆ بچووککردنەوە یا گەیاندنی مانای نازداری بەکار دەهێنرێن ، بەلام هەنیکیان جگە لە واتای بچووککردنەوە ، مەبەستی تریش دەگەیەنن»(۳) ئەگەر لەماوەی سی سالانداو لە دوو کتێبی رێزماندا « مەبەستی تریش » روون نەکرێنەوەو باس نەکرێن ، ئەی کەی‌و لەچ کتێبێکدا باس دەکرێن؟! لە زانستدا هێشتنەوەی مەسەلەکان بە نادیاری‌و لە موعەممادا لە جێی خۆیدا نی‌یە ، ئەمە جگە لەوەی کە گەلێك لەوانەی دوکتۆر بەوێنە هێناونی‌تەوە جێگای لێکۆلینەوەو سەرنج دانن .**

بچوککردنەوەی ناو لای مامۆستا سەعید سدقی برێتی‌یە لە « ئیسمێکی بچووکەو گەورەکەی خۆی نیشان دەدا »(٤) مامۆستا تۆفیق وەهبی‌ش هەر لەو بارەوە دەنووسێ « ئەو ناوانەی ئەداتی بچووکیان وەرگرتووە پێیان ئەلێن ناوی بچووك کراو »(٥) مامۆستا نوری عەلی ئەمین بۆ ناوی بچووککراو دەلێ ئەو ناوەیە کە بە هۆی هەندێ ئامرازەوە کە سەری ئەخرێ بچووکی‌یەکەی خۆی دەر ئەخا»(٦) بەلای ئێمە شەوە ناوی بچووککراو ئەو ناوەیە کە سیفەتی ناوەکە بە بچووککراوەیە دیار بخاو کۆمەلێك پاشگر لە رۆنانیدا هاوبەشی دەکەن بۆیە :

وولە ـ لە وشەی مێشوولە » دا پاشگر نی‌یەو بۆ مەبەستی بچووككردنەوەش بەکار نەهاتووە ، چوونکە لە وشەی مێشوولەدا مانای « مێش »ی بچووك ناگەیەنێ ، بەلکو مێشوولە جۆرە مەگەزێکی تایبەتی‌یەو لەمێش جیایە . لە رووی زانستەوە هەر یەکەیان چەشنە گیاندارێکن ، ئەوە هەیە لە بنەمالەو فەسیلەدا یەك دەگرنەوە ، لە رووی واتاشەوە هیچ کوردێك مێشوولە بە « مێش »ی بچووك نازانن ، لە رووی کارو جموو جولی رۆژانە شەوە هەر یەکەیان ئیشی خۆیان دەکەن ، هەر لەم بارەوە :

یلکە ـ لە وشەی « چاویلکە »دا پاشگر نی‌یە ، چاویلکە ماناو مەبەستی چاوی بچووك نادا ، بەلکو چاوێلکە ئامرازێکی تایبەتی‌یەو لەچاو دەکرێ،بەهۆیەوە چاو یا شتی دووری پێ‌نزیك دەکاتەوەو گەورەی دەکا یا بە پێچەوانەوە ، لە بارەی جەوهەرەوە ، چاو ئەندامێکی زیندووە لە سەری مرۆف یا هەر زیندەوەرێکداو حاسەی بینینە ، بەلام چاوێلکە ئامرازێکی ماددی بێ‌گیانەو خۆی بە تەنهاو موجەرڕەدی توانای بینینی نی‌یە ، کە ئەگەر چاوێلکە ، چاوێکی بچووك بوایە دەشیا توانای بینینی ببوایە . لە رووی روالەتیشەوە چاوێلکە هەمیشە لە چاو گەورەترە واتا لێرەدا مەبەست بچووككراو نادا بەلکو گەورەکراو دەگەیەنێ

**هەروەها یلە ـ لە وشەی ئەنگوستیلەدا پاشگر نی‌یەو هەرگیز ئەنگوستیلە بە مەبەستی پەنجە یا قامکی بچووك نەهاتووەو نایە دیسان هەر لەو پاشگرانەی دکتور بۆ بچوکردنەوە هێناونیەتەوە پاشگری وو ـ لە وشەی « پووشوو »دا پاشگر نی‌یەو بۆ بچووکردنەوەی پووش بەکار نەهاتووە ، پووشوو شتێکە لەناو قەدی**

دار پەیدا دەبێو لەشێوەی نیسفنجدا بە هۆی بەردو ئەستێوە بۆ ئاگرکردنەوە بەکار دێ ، هەموو ئەوانە کە دوکتۆر بە پاشگر ژماردوونی هەڵەنو بەهیچ جۆرێك لەو وشانەدا حسابی پاشگرییان لە گەڵدا ناکرێ ، ئەوانە وەك پاشگری (( ۆلە )) نین لە وشەی (( کیژۆلە ))دا ، لەکیژۆلەدا ماناکە دیارە مەبەست لە کیژی بچکۆلەیە(٧) .

دوکتۆر لە رەخنەیەکی دیکەیدا لە مامۆستا سەعید صدقی دەڵێ : (( مامۆستا واتێ گەیشتووە کە ئەگەر (( مضاف )) یا خود (( موصوف )) کۆتاییی‌یان بە دەنگی کۆنسۆنانت بێت ، ئەوە (( ی )) وەردەگرن ، بەڵام بێتو بە دەنگی بزوێن کۆتاییی‌یان بێت ، ئەو دەمە (( ی )) یان پێوە دەلکێ . هەڵەی نووسەر لەبەشی دووەم ـ واتە لە حاڵەتی کۆتایی بە بزوێن ـ دایە ، ئەویش ئەوەیە کە لەم حاڵەتەدا نیشانەکە دەبێتە (( ی ـ Y ـ وای لاتینی ـ ص . غ )) نەك « ی ـ i ـ ئای لاتینی ـ ص . غ » ل ١٩ـ ٢٠ . رێزمانی کوردی .

دوکتۆر ئەورەحمان لە لێکدانەوەی نووسینەکەی مامۆستا سەعید صدقی کابان چاك نەی پێکاوەو ماناو تێگەیشتنەکەی پێچەوانە کردۆتەوە ، ئەوەی دوکتۆر مەبەستیبی مامۆستا سەعیدیش هەر ئەو نیازەی دەربڕیوەو نووسیوە ، مامۆستا کابان زۆر بە وردی‌و زانایی‌یەوە هەستی بە « ی ـ Y ـ وای لاتینی » لە گەڵ « ی ـ i ـ ئای لاتینی » کرددووە .

با ئێمە نـه « مضاف » و « موصوف »ەکەی مامۆستا سەعید صدقی وردبینەوە ، بزانین ، چی دەڵێ ، چونکە بێگومان خۆی چاکترین سەرپشکە .

لە لاپەڕە « ١٤ »ی کتێبی « مختصر صرف‌و نحوی کوردی‌دا نووسراوە » اضافە بە ستنەوەی دوو ئیسمە بە یەکترەود لەم بەستنەوەیەدا مەعنایەکی خصوصی وەکو تەملیك یا اختصاص یا تەبەیین یا تەشبیە لی پەیدا دەبێ . بە واسطەی « ژێردار » کردنی موضافەکە ، بە شەرطێ ئاخر حەرفەکەی حەرفی ئیملا نەبێ . وەیا بە واسطەی ئیلحاق کردنی « ی » ئەگەر حەرفی ئیملا بێ کە پێی‌یان دەبێژرێ « ژێر » و « ی »ی اضافە وەکو :

شاگرد مەکتەب .

مامۆستای قوتابخانە(٨) .

یا لە تەوصیفدا دەڵێ « مەوصوف دائیمەن




« ژێردار » دەبێ بە شەرطێ ئاخر حەرفەکەی لە حەرفانی ئیملا نەبێ وەکو : « قلم درێژ ، کاغەز سپی، مندال زیرەك ، ئاو سارد » وە ئەگەر ئاخر حەرفی مەوصوف لە حەرفانی ئیملابوو لەباتی ژێر « ی » دادەنرێ‌و بەو « ی » دەڵێن « ی »ی وەصفی وەکو بەژێرەکە دەڵێن ژێری وەصفی . وەکو : بالای بەرز ، بەرووی شیرین ، ترێی سپی ، تەختەی رەش »(٩) .

ئەگەر بە چاوی وردەکاری لەو چەند رستەیەی مامۆستا سەعید بکۆڵینەوە زۆر بە تەواوی بۆمان دەردەکەوێ کە ویستویەتی‌و مەبەستی بووە بڵێ « ئەگەر لە مضاف موصوفدا وشەکان کۆتایی‌یان بە دەنگی کۆنسۆنانت هات ئەوە « ژێر ـ واتا « ی ـ i » پێوە دەلکێ ، وە ئەگەر بە دەنگی بزوێن کۆتایی‌یان بێت ئەو کاتە یاء ـ ی ـ Y ـ وای لاتینی» وەردەگرێ ، ئێستا بە چاکی بۆمان روون دەبێتەوە کە مامۆستا سەعید راستەو هەستی بە جیاوازی « ژێر ـ ی ـ i » لەگەڵ یاء ـ Y ـ ی » کردووەو بە دروستیش بەکاری هێناون ، بەڵام دوکتۆر لە لێکدانەوەو بۆ چوونەکەیدا باوەڕە کانی لێ پێچەوانە بوونەوە .

دوکتۆر ئەورەحمان ئەوجا دێتە سەر مامۆستا تۆفیق وەهبی‌و رەخنە لە کۆی ناو لای ئەم زانایە دەگرێ کە گوایا مامۆستا تۆفیق وەهبی « بۆ گەل

کردنەۆەی ناوێ ئەبی ئەداتی تەعریفی مەعیەنی لەگەڵ بێ » واتا ئەگەر ناو بکرێتـــەوە دەبێ نیشـــــانەی ناسیاوی لەگەڵ بێ ، دوکتۆریش دەڵێ « لەو رایەدام کە لەزمانی کوردیدا بە ئاسانی دەکرێ ناو کۆبکرێتەوەو نیشانەی ناسیاویشی لەگەڵ نەبێ، وەك پیاو ــ پیاوان، ژن ــ ژنان ، منداڵ ــ منداڵان ، ... هەروەهـــا هەڵدانەوەی بەرهەمی ئەدەبی کوردی ئەورایەی ئێمە دەچەسپێنی « د. ئەورەحمـــان ــ ص . غ » رای مامۆستا وەهبی رەت دەکاتەوە ، لەبەر ئەوەی سەدان نموونە دەبینرێن کـــە « ان » ی کۆ بێ یاریـدەی نیشانەی ناسیاوی ، کۆی سازکردووە » ل ــ ٢٣ . .
ئێمەش لێرەدا ئەوە زیاتر بۆ دوکتۆر ئاشکرا دەکەین کە نـــەك سەدان نموونـــەی ناو هەیە بە « ان » کۆدەکرێنەوە بەڵکو هەرچی ناوی کوردی هەیە جا هەر چەندێك بن گشتیان بە « ان » کۆدەکرێنەوە .

**ئەمە جگە لەو کەمە گۆڕانانەی بەسەر فۆنەتیکی ئەو وشانەدا دێ کە کۆتایی‌یان بە « وو ، ا ، ۆ ، ێ ، ی » هاتوون . بۆ نموونە ئەم وشانە .**

**خانوو ــ خانووان ــ لێرەدا بزۆینــی « وو » کەمێــك کورتتر دەبێو نیــوە بزوێنی « و ــ W » دەچێتە نێوانەوە .**

**هــەرمێ ــ هەرمێیـــان ــ نیوە بزۆینی « ی » دروست دەبێ .**

**خورما ــ خورمـــایان ــ نیوە بزۆینی « ی » دروست دەبێ .**

**قاپـی ــ قاپـــەیان ــ نیوە بزۆینـی « ی » دروست دەبێ .**

**چـەقۆ ــ چـــەقۆیان ــ نیوە بزۆینی « ی » دروست دەبێ .**

ئەو گۆڕانانەی لەو وشانەی کۆتایی‌یان بـــــە « وو ، ا ، ۆ ، ێ ، ی » هاتووە کاتێ « ان »ی کۆ دەچێتە سەریان ، جەوهەری نین‌و بەلای زانستەوە « وان ــ یان » هەمـــوو لە « ان »ەوە هاتـوون ، ئەلۆمۆرفی یەکترن‌و لە رووی رێزمانی‌یەوە هەر یەك کار دەکەن‌و باری دەیگەکان ئەو گۆڕانانەی دروست کردووە ؛ نیوە بزوێنێك چۆتە نێوان دوو بزوێنەوە، ئێمە لە کاتێکدا باوەڕمان وایە کە دەبی بۆ رێزمانـە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی نەتەوەییمان یەك جـۆرە نیشانەی « کۆ » ی یەکگرتوو بۆ ناوهەبی ، ئەوەش هەست پێدەکەین کە لە شێوە جیا جیاکانی کوردی‌دا ئاسایی‌یە نیشانەی « کۆ »ی دیکـــەیان هەبێ ؛ یان کۆمەڵێك وشە هەبێ نیشانەی کۆی جیا جیـایان بچێتە سەر بەڵام « ان » نیشانەیەکـی یەکگرتووەو دەچێتە سەر گشت ناوێك .

ئەم باوەڕەی ئێمە لە کاتی خۆیدا لە پۆلی سێ‌ی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانستگای سلێمانیدا لە گەڵ برای گەورەو خۆشەویستمان مامۆستای رێزمانی کوردی بەدرێژی لی‌یەوە دواوین ، کە مامۆستاکەش ئـەو کاتە وا بیری دەکردەوە کـە هەموو ناوێکـی کوردی هەرگیز بە « ان » نابنە « کۆ » بەڵام لە دوایـــدا ئەویش گەیشتە ئەو حەقیقەتەو ددانی بەو خاسیەتەی زمانی کوردیدا هێنا .

دوکتۆر رەخنە لە محـەمەد ئەمین هەورامانی دەگرێ‌و دەڵێ « نووسەر لەوەشدا بەهەڵە چـــووە کەناوی لە حالەتی « کۆ »دا بە وشـــەی دارێژراو داناوە ، بەتایبەتی لە کاتێکدا کە لە ریگای نیشانەی « ان »ی کۆوە پێك دێ ، وەك « کچـــان ، کـوڕان ، برایان ... » ل/٣٨ .

لە راستەقینەدا زمانی کوردی دوو جـــۆر پاشگری هەیە ؛ پاشگری رێزمانی کـــە دوکتـــۆر ئەرەحمان بە « نیشـــــانە » ی ناو دەبا ، پاشـــگری ئیشتیقاقی کە بەهۆیەوە بەشێکی ئاخاوتن دەکا بـــە بەشێکی دیکە ، وەك ئەو پاشگرانەی دەچنە ســـەر ناوی سادەو دەیانکا بە ناوی دارێژراو ، بۆ نموونە :

**ــ وان / ەوان ... وەك**
**شاخەوان ، رەزەوان .**
**ــ ایەتی ... وەك**
**برایەتی ، خزمایەتی .**

**یا ئەو پاشگرانەی دەچنە ســـەر ئاوەڵنـاوی سادەو دەیانکاتە ناوی دارێژراو ، بۆ نموونە :**

**ــ ی ــ ... وەك ... کەڕ ــ کەڕی**
**جوان ــ جوانی .**
**ــ ەمەنی ... وەك**
**سارد ... ساردەمەنی**

**یا ئەو پاشگرانەی دەچنــە سەر ئاوەڵکرداری سادەو دەیانکاتە ناوی دارێژراو ، بۆ نموونە :**

**ــ ەوا ــ وەك**
**پێش ... پێشەوا .**

هەروەها ئەو وشانەی دیکـەی کـە لە ریگای وەرگرتنی پاشگرەوە دەبنە وشەی دارێژراو ، جـــا

ئەو وشە دارِێژراوانە « ناوی دارِێژراو ، ئاوەڵناوی دارێـژراو ، کـرداری دارِیـژراو یا ئاوەڵکـرداری دارێژراوبن . هەموو ئەو پاشگرانە لە مۆرفۆلۆژیدا بە مۆرفیمی بەند لە قەڵەم دەدرێن ، چونکە سـەر بەخۆ هیچ مانایەك نابەخشن ، بەڵام لە رونانی وشەدا کەڵك دەدەنو هاوبەشی دەکەن ، ئەگەر پاشـگری رێزمانی « نیشانە » لە گەڵ پاشگری ئیشتیقاقـی وەرگرینو بەراوردیان بکـەین بۆمان دەردەکـەوێ هەردووکیان مۆرفیمی بەندن ، لێرەدا ئەوە هەیە لە ئەرکو چالاکیدا لە یەکدی جیاوازن .

بەو حسابەی کە محەمەد ئەمـین هەورامانی پاشگری رێزمانی « نیشانەی کۆ »ی بە پاشـگری ئیشتیقاقی بزانێو بیـەوێ ناوی دارێژراوی پێ دروست بکا ، زیاتر بیرکردنەوەی دەوێ .

با تەماشا بکەین بۆ تاریفکردنی ناوی سادە ، دەبێ چی بڵێین : ناوی سادە مۆرفیمێکی سەر بەخۆی واتادارە بۆ ناونانی شتێك ، گیاندارێك ، کارێك یـا فیکرەیەك « بیرێك » بەکار دێ . ئـەم وشانە ناوی سادەن :

دار ، هەڵوژە ، گوڵ ، شار ، هێز .. هەروەها.

ئەگەر لە رستەیەکدا دوو ناوی تێدا بوو یەك وشە بوو ، لێکدانەوەمان بۆ ئـەو دوو ناوە لەدوو دۆخی جیاوازدا دەبێ چی بێ ؟! بۆ نموونە :

**بە شاری کەرکووکدا دەچینە شارەکانی دیکەی کوردستان .**

**لەو رستەیەدا دوو وشەی « ناو »مان هەیـە ئێمە ئیشمان پێیان هەیە .**

**یەکەمیان : شار لە « شاری کەرکووك »دا**

**شار : ناوێکی سادەی تاکە .**

**دووەمیان : شارەکان لە « شارەکانی دیکـەی کوردستان »دا .**

**شارەکان : ناوێکی سادەی کۆیە .**

ئەوەی سەرەوە جۆرە لێکدانەوەو بۆ چوونێکی تایبەتییە ، کە بۆ دوو ناو لە دوو حاڵەتی تایبەتیدا بووترێ ناوی سادە . بەڵام دیارە لـە رووی ماناوە شار ــ لەگەڵ ــ شـارەکان ــ جودان ، لـە رووی پێکهاتنیشەوە « شارەکان » دوو نیشانەی پێـوە لکاوە ، نیشانەی ناسیاوی‌و نیشانەی کۆ ... لەم بارەدا کە هەر بە ناوی سادەی کۆ بزانرێ وەك دوکتۆر ئەورەحمان دەڵێ ، ئەوا پێویستە ناوی سادە جۆرە گۆڕانێك لە سنوری تاریفەکەیدا رەست کاری بکرێ، وە ئەگەر وا نەبێ ئەوا دیارە دەبێ ناوی دارێژراو بێو بچێتە سەر باوەڕەکەی محەممەد ئەمین هەورامانی . هەردوو لێکدانەوەکەش کۆتایی نینو قسەی زۆریان لە سەر ماوە .

دوکتۆر لە رەخنەیەکی دیکەیدا لە محەممـەد ئەمین هەورامانی ئەوەیە کە دەڵێ : « هەڵەیـەکی دیکەشی ئەوەیە کـە جگـە لە « ان » و « ات » ، « یان » و « هات »یش بـە دوو نیشـانەیتر تێگەیشتووە . » ل / ٣٨ .

محەممەد ئەمین هەورامانی نیشانەکانی « کۆ » کە ئەو بە پاشبەندی « کۆ » ناویان دەبا بە « ە » پێنج نیشانە دەزانێ کە ئەمانەن « ان ، گەل ، یان ، ات ، هات »(١٠) .

ئەو لێکدانەوەو بۆ چوونەی هەورامانی نیوەی راستەو نیوەی هەڵەیە ، راسـتەکان نیشـانەکانی « ان ، گەل ، ات »ن ، هەڵەکانیش برێتین لە « یان ــ هات » ، چونکە « یان » نیشانەیەکی سەر بەخۆ نییە بەڵکو هەر نیشانەی « ان »ەو لە ئەنجامی پێوەلکانی دەنگە بزوێنەکانی « ا ، ێ ، ی ، ۆ » دروست بووە ، وەك .

**چرا + ان = چرایان .**
**بەهێ + ان = بەهێیان .**
**ماسی + ان = ماسییان .**
**مەکۆ + ان = مە کۆیان .**

نیشانەی « هات »یش هەر شێوەی نیشانەی « ات »ەو بوونی هەندێ دەنگی ڤاوڵ ئەو گۆڕانانەی بە سەردا هێناوە ، جاری واش هەیە دەبێ بـە « جات » بەڵام هەر سێکیان واتا « ات ، هات ، جات » یەك نیشانەنو ئەویش « ات » . نموونـە وەك :

**دێ + ات = دێهات .**
**میوە + ات = میوەجات .**

جگە لەو ناتەواویانەی هەورامانی ، کۆمـەڵێ شت کە پەیوەندی‌یان بە « کۆ »وە هەیە بەلایدا نەچووە وەك : : ەها لە هەزارەها ، سەدەها ، یا بەکارهێنانی ژمارە یا « دەستە ، چەپك ، لیژنە ، چەند ، زۆر ..».

لە لاپەرەکانی « ٥٦ ــ ٦٣ » چەند هەڵەیەکی بۆ نووسەری ئەم یەك دوو وشەیە راست کردۆتەوە ، لێرەدا زانستو قەناعەتی خودی خۆمان وامـــان

لێدەکا ، راستکردنەوەکانی دوکتۆر بەو پەڕی شادمانییەوە وەربگرین ... رەنگە زیادە ڕۆیش نەبێ کە بڵێین لە هەندێ کاری زمانەوانی تایبەلی خۆماندا ماوەییەك دوو ساڵێك دەبێ زوربەی زۆری باوەڕی ئەو وتارانەمان گۆڕاون ، ئەمەش ڕۆڵی خۆی لەوەدا دەبینی کە بۆچوونەکانی دوکتۆر لە هەندێ شوێندا قبول بکەین .

بەلام کاتێ ئێمە رەخنەمان لە کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ـ لیژنەی زمانو زانستەکانی ـ کۆڕی زانیاری کورد ـ گرتووە ئەم رستەیەمان « ناو ئەو وشەیەیە مانای یەك وشە دەگەیەنێ » نەخستۆتە نێو دوو کەوانی گچکەو نەمان کردووە بەمولکی لیژنەی زمان زانستەکانیی کۆڕ ـ وەك دوکتۆر لە لاپەڕە «٥٧»دا نووسیوێتی بەڵکو تەنها « ئەو وشەیەیە »مان خستۆتە نێو دوو کەوانەوە ، تکایە لەم بارەوە دوکتۆرو خوێنەری زمان بگەڕێتەوە سەر ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە / ٣٦٦ ، ڕۆژی ٤ـ٥ـ١٩٧٧ ، لاپەڕە / ٤ ، دێری « ١٠ » بۆ ئەوەی بزانرێ وا نەنووسراوەو دوکتۆر بە هەڵە بەو شێوە گواستویەتییەوە .

**وتاری دووەم :**

**دوکتۆر ئەوڕەحمان کاتێ رەخنە لە بەکارهێنانی پاشگری ((ی))ی نووری عەلی ئەمین دەگرێ لە پەراوێزی (( ٢٦ )) لاپەڕە (( ١١٥ ))دا دەنووسێ (( مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە دیاریکردنی ئەم پاشگرانەدا ((ی)) و ((یی)) بە دوو پاشگر داناوەو وشەی (( ئاشەوانی ))و (( ساوایی ))ی بە نموونە بۆ هێناونەتەوە بەلام مامۆستا لەمەدا بە هەڵەدا چووەو یەك پاشگرن ، کە ئەویش ((ی))یە .**

**دوکتۆر لەوەدا زۆر راست دەکا کە پاشگری ((ی)) لەگەڵ ((یی)) یەك پاشگرن ، ئەوەی دووەمیان لە ئەنجامی بزۆینی ((ا))ی ((ساوا))وە دروست بووە . دوکتۆر کە باسی پاشگری ((ی)) مەعنەوی دەکا لەنموونەکەی نووری عەلی ئەمیندا هەستی بەوە ـ نەکردووە کە وشەی ((ئاشەوانی)) ناوێکی داڕێژراوەو لە ناوێکی سادەو دوو پاشگر دروست بووە کە بەم شێوەیە (( ئاش + ەوان + ی )) بۆ بەڵگەش کە دوکتۆر بەلای ئەمەدا نەچووە ، یەکەم ئەوەیە کە ئەم هەڵەیەی بۆ نووری عەلی ئەمین وەك وشەکە راست نەکردۆتەوە . دووەم چونکە ئەو نموونانەی دوکتۆر بۆ پاشگری ((ی)) مەعنەوی پێشکەشی کردوون ناوی سادەنو ((ی))یان چۆتە سەر ، وەك : منداڵ ـ منداڵی، هەلاج ـ هەلاجی ، هەروەها لە نموونەی بەکارهێنانی پاشگری ((ەتی)) لە وشەی (( نانەوایەتی )) ئەو هەڵەی دووبارە کردووتەوە کە (( نانەوا ))ی وەك ناوی سادە مامەڵەکردووە ، بەلام لە راستەقینەدا (( نانەوا )) ناوێکی داڕێژراوە ، وشەی ((نانەوایەتی ))یش ناوێکی داڕێژراوەو لە ناوێکی سادەو دوو پاشگر دروست بووە کە بریتییە لە (( نان + ەوا + ەتی )) . ئەمەی لە پەراوێزی (( ١١٦ ))دا نووسیوە لە کاتێکدا کە نموونەی بۆ (( ەتی )) هێناوەتەوە ((پیاوەتی ، برایەتی)) بە چاکی پێشکەشی کردوون . ئێستا دەگەینە ئەو ئاکامەی کە پاشگری ((ی))ی مەعنەوی دەچێتە سەر ناوی سادەو ناوی داڕێژراویش ، وەك بۆ چوونە سەر ناوی سادە : منداڵ ـ منداڵی ، چوونە سەر ناوی داڕێژراویش مەلەوان ـ مەلەوانی ، ئاشەوان ـ ئاشەوانی ، دارەوان ـ دارەوانی ، پاشگری ((ی)) مەعنەوی دەچێتە سەر ئاوەڵناوی سادەو ناوی داڕێژراو دروست دەکا ، وەك : بەرز ـ بەرزی ، بلند ـ بلندی .**

بەڵگەیەکی راستەقینەی دیکەی کە دوکتۆر هەستی بەوە نەکردووە کە پاشگری یێی مەعنەوی دەچێتە سەر ناوی داڕێژراو ئەوەیە کە نە لە کتێبی ڕێزمانی کوردیدا ، وە نە لە کتێبی وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا تاقە یەك نموونەی بۆ ئەو جۆرە ناوە داڕێژراوانە نەهێناوەتەوە کە لە ناوی داڕێژراو + پاشگری « ی » دروست دەبێ(١١) .

دوکتۆر ئەوڕەحمان کە نموونە بۆ پاشگری «ەن» دێنێتەوە کە دەچێتە سەر ناوی سادەو دەیکاتە ناوی داڕێژراو ، وشەکانی « پووشەن ، چیمەن » دەنووسێ ـ ل/١١٨ ، بەلام لەوشەی « چیمەن »دا «ەن» پاشگر نییەو بەشێکە لە وشەی سادەی چیمەن، ئێمەو زمان دۆستانی زمانی کوردیو ئەوەندەی چاومان بەدێهاتیو کارگوزاری کشتوکاڵ کەوتبێ لەو بڕوایەداین کە لەزمانی کوردیدا ناوێکی سادە بە شێوەی « چیم » نەبێ ، بەڵکو وشەکە واتا « چیمەن » یەك وشەی سادەیەو بە هیچ جۆرێك ناوی داڕێژراو نییە .

لە لاپەڕە « ١١٨ » زنجیرەی « ٢٢ » پاشگری « جاڕ »ی هێناوەتەوە کە دەچێتە سەر ناوی سادەو

ناوی دارێژراو دروست دەکا ، بۆ بەڵکەش « نێرگزه جار ، تووتنه جارِ »ی به نموونه نووسیون ، بەڵام ئەو پاشکره « مجارِ »ه نەك « جارِ » . لەبەر ئەوەی لـــه هەموو ئەو ناوانەی ئەو پاشکرەی دەچێته ســـەر بەشـــێوەی «ەجارِ»دێت . لەو ناوانـــەی بەڤاولیس کۆتاییان دێ دیسانەوە بزوێنی «ە»ی «ەجارِ» خۆی دەپارێزی‌و دەنگێکی نیوە بزوێن لەنێوانیاندا دروست دەبێ .

بۆ پاشکری «مڵ» که دەچێته سەر ناوی ساده له لاپەرِه « ١٢٠ » زنجیرە « ٣٢ » دوکتۆر وشـــەی « کۆمەڵ »ی به نموونه هێناوەتەوه ، کەچی وشەی « کۆمەڵ » له شێوەی دارشتنیدا ناوێکی ســـادەیەو هەرگیز له وشەی « کۆم + پاشکری « مڵ » دروست نەبووە ... له شێوەی کرمانجی خواروودا « کۆم » به چەند مانایەك دێ که یەکێکیان مانای چـــەماوە یا کوورِ دەبەخشێ ، یەکێکی دیکه بۆ دوابەشـــی کـــۆ ئەندامی هەر سێ گیاندار بەکاردێ له بروایه داێن کەوشەی کۆمـــەڵ ناوێکی ســـادەیەو لەروالـــەتی‌و دروستبووندا تاکـــەو له ناوەرۆکدا مانای‌کۆمـــەڵ دەگەیەنێ ، نەك ناوێکی دارێژراو بێ وەك دوکتۆر بۆی چووه ، ئەم هەڵەیه مامۆستا نووری عەلی ئەمینیش له لاپەرِه «١٥»ی کتێبی گرنگی کەلێنێکی تر له رێزمانی کوردی لەوەپێش کردوویەتی ، دوکتۆر « مڵ » وەك پاشکری بچـــووك کردنـــەوه یا بۆ مانای نازداری لێك دەداتەوه ، یا دەڵێ پاشکری بچووك کردنەوه مەبەستی تریش دەگەیەنن « ل / ١٢١ ــ ١٢٢ » که دەبوایه ئەو مەبەستانەی تریش روون بکاتەوه چین ، چونکه جێگا له کیتبی رێزمانی کوردی فراوانترو له بارتر دەبێ چ شوێنێکی دیکه بێ ؟! ، دیسانەوه ئەوه بێ ، دوو دڵی دووباره دەکەینەوه که کۆمەڵ نه ناوێکی بچـــووك کراوەیەو نه بۆ مەبەستی نازداریش بەکار دێ .

لـــه لاپـــەرِه « ١٢٣ » زنجیرەی ، پاشـــکری « نیه » نموونەی دۆینه ــ مەسینە»ی هێناوەتەوه ، نموونەی « مەسینه » جێگای گومانه ، وشـــــەی « مەس » به مانای ناوێکی سادەی کوردی ئەوەندی ئێمه پێ بزانین له دەوروبەری خۆمان‌و لەنێو کتێباندا نەبستوومانەو نه بەرچاووانیشمان کەوتووه ، ئەگەر « مەس » ناوێکی ســـــاده بێ ، دەبوایه له کاروباری رۆژانەدا یا له نووسیندا بەکار بهاتایه ، هەر ئەوه وا دەکا وشەی « مەسینه » به ناوێکی ساده بزانین‌و « ینه » بۆ ئەو وشەیه پاشـــکر نیە ، بەڵام لـــه « دۆینه »دا ئەوه بێ ئەم ســـەرو ئەو سەر قبـــول دەکرێ .

ئەگەر ناوی دارێژراو برێتی بێ « لـــەو ناوه ناسادەیه که له وشەیەکی سادەو زیادی پێکهاتبێت ناسادەیه که له وشەیەکی سادەو زیادی پێکهاتبێت ، ئەوجا زیادی‌یەکه پێشگر یا پاشـــگر یا هـــەر دوو « پێشگرو پاشگر » پێکەوه بن » ل / ١٠٦ ــ ئـــەوا ئەو نموونانەی که دوکتۆر بۆ ناوی دارێژراو لـــه لاپەرِه ــ ١٣٢ ــ ١٣٣ »دا هێناونی‌یەتەوه هەڵەن . وەك ئەو نموونانه .

وتار ــ وت + ار ــ له « وتن » موه .
کوشتار ــ کوشت + ـار ــ له « کوشتن »موه.
کریار ــ کرِ + یار ــ له « کرِیا »موه .
نووسەر ــ نۆوس + مر ــ له « نۆوسین »موه .
رێژمن ــ رێژ + من ــ له « رژان »موه .

زوریەی ئەو نموونانەی بۆ ناوی دارێژراو لـــه بەشی « جــ » لاپەرِه ــ ١٢٨ ــ ١٢٩ ــ ١٣٠ ــ ١٣١ کـــه پاشـــکر دەچێته ســـەر رەگی کرداری رابردوو ئێستا دروست نین ، چونکه رەگی کردار مانای یەیە، ئەگەر چی له بیرکردنەوەو دارِشتنیاندا که دەبنەکردار یا ناو مانایەك لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن . بەڵام وەك رەگی پەتی‌و پاشکرو پێشـــــکر یا حێناو .. مانـــا نابەخشن . ئەگەر بمانەوێ رەگی کرداریش کەپاشکری پێوه بنووسێ‌و ناوی دارێژراو دروست بکا ئـــــەوا دەبێ پێناسەی ناوی دارێژراو بگۆرِرێ‌و سنورەکەی فراوانتر بکرێ . هەر بەو بۆچوونه له لاپەرِه «١٣٣»دا کەپێشکری بـــــه رِەگی کردارەوه ناوەو دەڵێ ناوی دارێژراو دروست دەکەن ... لەگەڵ مەنتیقی تاریفی ناوی دارێژراودا یەك ناگرنەوه .

بۆ نموونەی ناوی لێکدراو که له ناوێکی سادەو وشەیەکی بێ واتا به یارمەتی «ئینەرفیکس» دروست بووه سێ نموونەی هێناوەتەوه ، ــ یەکێکیان » گیاو گژ »ه ، بەڵام ئەوی راستی بێ ئەو وشەیه له زمانی کوردیدا به « گژوگیا » ناودەبرێ ، بۆیه نموونەی بەو شێوه دەبێ وشەیەکی بێ واتاو ناوێکی ساده بێ کـــه بەو جۆرەش بوو نابێته ناوی لێکدراو ، چونکه ناوی لێکداراو « ئەو ناوه ناسادەیەیه که بەلای کەمەوه دوو وشـــەی واتاداری تێدا بێ ... ل / ١٠٦ » ئـــەو بیانووەی دوکتۆریش که له پەراوێزی « ٦٨ » لاپەرِه

« ١٣٦ »دا دەڵێ « ئەگەر یەکێك لەو دوو وشەیەی ناوی لێکدراو پێك دێنن ، بێ واتا بێ ، ئەوە ئەم جۆرە پێکهاتنە لە گەڵ پێناسەی ناوی لێکدراودا ، کە وتراوە ئەو ناوە ناسادەیەیە کەوا بەلای کەمەوە دوو وشەی واتاداری تێدا بێ ، ناگونجێ ... بەڵام لەبەر ئەوەی بەزۆری وشە بێ واتاکە لە واتادارەکەوە داتاشراوە یاخود وشە ناسادەکە بەشێوە لێکدراوە ، بۆیە ئەو جۆرە حالەتانەمان لەگەڵ ناوی لێکدراودا باس کردووە .. ل / ١٣٦ » .

ئەم داخوازی‌یەی دوکتۆر رەچاوناکرێ‌و دەبێ یا پێناسەکە جۆرە گۆڕانێکی بەسەردا بێ یا ئەو نموونانەی وەك « قەرزو قۆڵ ، گوڵ‌و موڵ ، هەنجیرو مەنجیر » هەڵەن .

لە زانستی زماندا بەو وشانەی ئەو شێوە پێکهاتنانەیان هەیە کە ناوێکی سادە لەگەڵ مۆرفیمێکی بێ واتادا بەهۆی «و» پێکەوە دەبەسترێن پێیان دەوترێ ریدوپلیکیشن ـ Reduplication .

ئەو جۆرە وشانە لەوە ناچن نە وشەی لێکدراو نە وشەی داڕێژراوبن ، رەنگە شتێك بن لە نێوان هەر دووکیاندا ، جۆری دارشتنیان زیاتر لە گۆڕینی تیپی یەکەمی وشەیەکی سادە ناوی سادە ، ئاوەڵناوی سادە ، ئاوڵکرداری سادە » بە پیتی « م » دروست دەبن ، وەك کوڕو موڕ ، جوان‌و موان ، پێش‌و مێش .

ئەو وشانەش کە یەکەم تیپیان « م » بێت ئەو جۆرە پێکهاتنەیان لێ دروست نابێ .

**د. ئەوڕەحمان باوەڕی ئی . تا . سمیر نۆفا دەداتە دواوە بۆ ئەوەی کە نیشانەی ((ێك))و ژمارەی ((یەك))ی بە یەك شت داناوە ... دوکتۆر لە پەراوێزی لاپەڕە ((١٤٣))دا دەنووسێ (( راستە نیشانەی ((ێك)) لە ژمارەی ((یەك))ەوە وەرگیراوە ، بەڵام وەك دوو مۆرفیمی سەربەخۆ خۆیان دەنوێنن‌و لەکارکردنیاندا جیاوازی لە نێوانیاندا بە دەردەکەوێ .**

**بەلای ئی . تا . سمیر نۆفاو دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارفەوە نیشانەی ((ێك)) لە ((یەك))ەوە وەرگیراوە ، هەتا ئێرە کێشەی لەسەر نی‌یەو باوەڕێکی تەواوە ، ئەو دوو نیشانەیە کە لە بنەرەتدا یەك نیشانە بوون ، بۆ ساغ‌کردنەوەیان پێویستی بە لێکۆلینەوەیەکی مێژوویی نیشانەکان هەیە ، ئەگەر چی ((یەك)) دەچێتە پێش (( ناو یا ئاوەڵناوە ))وە ، یەك دەچێتە دوای ئەوانەوە ئەم شێوە بەکارهێنانە جوداوازی‌یان هەیە ، بەڵام لە ماناو مەبەستدا رەنگە هەست بە دوورکەوتنەوەیان نەکرێ ، چونکە لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە هەرکامێکیان بە کاردێ دەتوانرێ بگۆڕدرێن بەوی دیکەیان بێ ئەوەی نە ماناکەو نە دارشتنی رێزمانی‌یەکە هەڵەی تێ بکەوێ ، ئێمە وا دەزانین وەرگرتنی ((ێك)) لە ((یەك))ەوە بە ماوەیەکی دوورو درێژ دروست بووە ، دەشێ مەسەلەی سووك‌و سۆڵی‌و خۆشی ((ێك)) بە گوێ هێنابێتی‌یە مەیدانەوە ، وەك زۆر لەو نموونانە کە ئەو کارتێکردنە رۆلی خۆی تێدا بینیوە بۆیە ئێستا چ لە نووسین چ ئاخاوتندا نیشانەی ((یەك)) کەمتر بەکار دێ .**

**نیشانەی ((ە)) ناسیاوی**

**دوکتۆر لە چالاکی‌و روونکردنەوەی کاری نیشانەی ((ە))ناسیاوی‌دا دەڵێ : (( ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (( ا ، ۆ ، ێ ، ی ، ە )) بێت ، ئەو کاتە (( ە )) وەرناگرێ . لەم حالەتەدا بە قەرینە تێدەگەین کە مەبەست باس لێکراوێکی دیاری‌یە ، وەك :**

**چرا + ە = چرا .. چرا نەوتی تێدا نەما .**

**هەلۆ + ە = هەلۆ .. هەلۆ دای لە شەقەی باڵ .**

**دێ + ە = دێ ... دێ وێران بوو .**

**مراوی + ە = مراوی لە ترسان لەرزی .**

**پەنجەرە + ە = پەنجەرە .. پەنجەرە کرایەوەو رەشەبا خۆی‌کرد بەژووردا لە دوایێدا دەڵێ (( بەشێك لەو جۆرە وشانە هەندێ جار بە یارىدەی نیمچە بزوێنی (( ی ـ Y )) ، نیشانەی ((ە)) وەردەگرن، وەك :**

**قەلا + ی + ە = قەلایە ... دەرگی قەلایەی کردەوە ـ ل/١٩٨ ـ ١٩٩ .**

لە زمانی کوردیدا دوو نیشانەی ناسیاویمان هەیە بە ناو یا ئاوەڵناوەوە دەنووسێن ، نیشانە ناسیاوی‌یەکانیش ناوەکە یا ئاوەڵناوەکە دیاری دەکەن‌و بە خوێنەرو گوێگریان دەناسێنن .

نیشانەی «ەکە» بێ‌کێشە باس کراوە ، بەڵام نیشانەی « ە » هەندێ کەم‌و کوڕی‌و گرفتی تێ‌کەوتووە .

ئێمە وا دەزانین ئەو وشە ناوانە یا ئاوەڵناوانەی کۆتایی‌یان بە بزوێنی « ا ، ۆ ، ێ ، ی ە » دێ کە

نیشانەی «ە» دەچێتە سەریان هەر وەدیار دەکەوێ تێ ناچێ ، ئاشکرایە کە نیشانەکــــە بەدەرەوە بــێ پێویستمان بە قەرینە نابێ ، ئەوە هەیە لە نێوان ئەو بزۆینانەو نیشانەکەدا نیمچــــە بزۆینێ « ی ـ Y » پەیدا دەبێ ، وەك :

**کابرا + ە = کابرایە ...**
**پەڕۆ + ە = پەڕۆیە ...**
**هەرمێ + ە = هەرمێیە ...**
**ماسی + ە = ماسییە ...**
**پەردە + ە = پەردەیە ...**
**نموونە بۆ ئەو ناوانەی سەرەوە .**
**کابرایەی کە دوێنێ قسە لە گەڵدا کرد خالم بوو**
**پەڕۆیەی لە سەری ئاڵاند .**
**هەرمێییەی کردە قەرتاڵەکەوە .**
**ماسییەی لە ڕۆندا سوور کردەوە .**
**پەردەیەی گرت بە پەنجەرەیەدا .**

**ئەگەر بـــەو شێوەی د. ئەوڕەحمان دەڵــێ نیشانەی «ە» ناسیاوی بەکارهێنرا ئەوا لە ئاخاوتن یا نووسیندا بێ ڕەنگە دروست نەبێ ، چ بۆ قسەکەرو چ بۆ نووسەریش دەبێتە نەشارەزایی بەکارهێنـانی زمانی کوردی ، چونکە مەرجی ڕێزمانی ناهێڵێ و کورد ئەو جۆرە دارشتنەی نییە .**

**هەتدێ سەرنجی تێکرایی :**

زۆرانبازیی و دژوارییەکانی مرۆ ڤو سروشـتو پەیوەندییەکانی ئەو دووانە وایان کردووە چ لــــە جەوهەرو چ لە فۆرمدا گۆڕانو پێشکەوتن دروست بێ . چالاکیی و بیرکردنەوەی هەمیشـەیی مرۆ ڤ لـــە هەر سـەردەمو شوێنێکدا ـ شێوەیەکی تایبــــەتیی و دیاری کراوی وەرگرتووە . ئەمە لە خۆیدا بۆ دوو ئامانجی پیرۆزی مرۆڤایەتییە ، لە لایەکەوە مانەوەو بە پێوە وەستان ، لە لایەکی دیکەوە دەست بەخۆدا هێنانو چوونە پێشەوە . پشت بە پشتو نەوە بــە نەوە کەڵك لەوانی پێشین وەردەگرن ، لە بەرهەمی کارو بیری رابوردوو شتی لی زیاد دەکەنو ئــەوی خراپ یا نەشیاو بێ پاکۆی دەدەن .

ڕێزمانیش وەك زانستێك ، گۆڕانی بەســەردا هاتووە ، لێکۆڵینەوە تازەو تێڕوانینە وردەکانی زانا گەورەکان لە جیهانی ڕێزمانـــدا نوێکاریی و گۆڕانو پێشکەوتنیان دروست کردووە ، دەیانو بگرە زیاتریش نهێنی زمان دۆزراونەوە کە هەر یەکەیان تێگەیشتنو دیراسەکردنی زمانیان ئاسان کردووە .

دیارە دەبێ ئەو پێشکەوتنە ڕێزمانی کوردیش بگرێتەوە، ئەگەر چی نووسین لە سەر ڕێزمانی کوردی لە کوردستانی خوارووودا لەنێو چەرخێکی تێپەڕاندووە، لە چەندێتیی و زۆرکردنی شـــێوەدا کاری گـەورەو چاك کراوە ، دەیان کتێبو نووسین بڵاوبوونەوەو زۆر لە زمانەوانان هاتوونە مەیدانو بەرهەمی ڕەنجی خۆیان پێشکەش کردووە ، بەڵام لە ناوەڕۆكو چۆنیەتیـــدا گۆڕانێکی ئەو تۆ کەشایانی باسکردنو لێ دووان بێ بە خۆیەوە نەبینیوە ... ڕێبـــازی لێکۆڵینــەوەی مامۆستا سەعید صدقیی و تۆفیق وەهبی زانا زۆر لە یەکەوە نزیکن و جوداوازی هەست پێکراویان نییە، کارەکانی مامۆستا نوری عەلی ئەمینو مامۆســـــتای گەورە شێخ محەمەــــەدی خاڵ لەگەڵ ئەوانـــەی پێشوو ـ و ئەوانــــەی دوای خۆیان لە شـــێوەی لێکۆڵینەوەدا یەك دەگرنەوە ، ئیشــە ڕێزمانییەکانی دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارفیش هەر لەمەداری بۆ چوونی ئەواندا دەسوڕێتەوە ، ئەمە لە کاتێکـــدا دوکتۆر لە چەندێتیدا لە مەڵۆیەکی زیاتر خســتۆتە سەر خەرمانی ڕێزمانی کوردی .

دوکتۆر لە کتێبێکی قەبەی « ٢٨٤ » لاپەڕەییدا کەم تا زۆر بەلای « کاری ناو » دا نەچووە ، باسی ئەوەی نەکردووە کە « ناو »لە ڕێزماندا چ دەورێك دەگێڕێ و تواناو چالاکی بەشە گــــەورەی ڕێزمـــانی دیاری نەکردووە .

ئێمە وا لێرەدا بە پێی لێکدانەوەیەکی ساکارو سەرپێیی شتێك لە بارەی « کاری ناو » لــــە زمانی کوردیدا دەنووسین ، بە نیازی ئەوەی دوکتۆرو زاناو لێهاتووانی ئەم مەیدانە بە چاوێکی دڵسۆزییەوە بۆی بڕوانن و ئەوانیش هەوڵەکانی خۆیان لە بارەی « کاری ناوە »وە پێشکەش خوێنـەرانی خۆشەویســـتو کتێبخانەی کوردی بکەن .

کاری ناو لە زمانی کوردیدا :

ئەو هەوڵانەی بۆ تاریفی ناو دراون زۆرن ، بەڵام لە هەموویان تێرو تەسەلتر ئەو پێناسەیە کە دەڵێ « ناو وشەیەکە بۆ ناو نانی شــتێك ، گیانـــدارێك ، کارێك ، یا فیکرەیەك بەکار دێ » .

جا بۆ ئەوەی تێگەیشـــتنمان بەرامبــەر ناو چەسپاوتر بێ چاك وایە دەوری ناو لە ڕستەدا دیاری بکەینو بزانین دەتوانێ چ شوێنێك بگرێ .

١ـ ناو دەتوانێ ببێ بە (( بکەر )) :
دیارە بۆ (( بکەر )) کەچی‌یە نووسینی زۆری لە بارەوە بلاوکراوەتەوە ، لێرەدا ئێمە نامانەوێ هەموو ئەو کارانەی کە لە (( بکەر )) دواون دووبارە بکەینەوە تەنها ئەوە نەبێ بە سادەیی جۆرە تاریفێکی (( بکـەر )) دەکەین .
بکەر ـ گرنگترین وشەیە لە رستەدا کـــــە پەیوەندی بە کردارەوە هەبێ ، هەر گۆڕانێك بەسەر (( بکەر ))دا بێ کار دەکاتە سەر کردارەکەش ، واتا ئەو وشەیەی کە لە رستەدا گۆڕاو لەگەڵ خۆیـــدا کرداری گۆڕی ، پێی دەڵێن بکەر . نموونە .
کوڕەکە هاتەوە .
کوڕەکان هاتنەوە .
کوڕەکە ـ کوڕەکان ـ ناون ، بکەرن .
٢ـ دەبێتە تەواوکەری نیهاد :
نیهاد لە رستەدا کارێکی دەدرێتە پاڵ ، ئەگەر لە رستەیەکدا کارێکی تێدا بێ دیارە کردنی ئەو کارە بە بێ جولێنەرو تاوێك نابێ ، ئەو بەشەی کە کارەکەی دەدرێتە پاڵ نیهادە ... نیهاد مەرج نی‌یە وشەیەکی سەربەخۆ بێ ، بۆیە جاری وا هەیە لە وشەیەك زیاتری دەچێتە سەر ، بەوە دەگوترێ تەواوکەری نیهاد ، ناو لە توانایدا هەیە ببێتە تەواوکەری نیهاد ، وەك :
مانگاکەی هەمینی گەڕایەوە پشتێرەکە .
هەمینێ ـ ناوە ـ تەواوکەری نیهادە .
٣ـ دەبێتەکراو :
کراو ... وشەیەکە قورسایی کرداری رستەکەی دەکەوێتە سەر ، وەك :
بە سواری ئەسپەکە چوومەوە بۆ ناو دێ .
ئەسپەکە ـ ناوە ـ کراوە .
٤ـ توانای ئەوەی هەیە لە دوای ژمارەوە بێ ، وەك چەند پیاوێك بە میوانی هاتنە گوندەکەمان .
پیاوێك .. ناوێکی نەناسیاوە ، لە دوای ژمارەوە هاتووە .
٥ـ لە دوای ئامرازی ئیشارەتەوە دێ . وەك :
ئەو زۆڕبایە چاڵە دەگرێ .
زۆڕبا ـ ناوە لـــە دوای ئامرازی ئیشـــارەتەوە هاتووە .
٦ـ لە دوای ئامرازەکانی پەیوەندی‌یەوە دێ :
ئامرازی پەیوەندی مۆرفیمێکە لە پێش ناوێکەوە دێ‌و پەیوەندی ئەو ناوە لەگەڵ وشـــەی دیکـــــەی رستەکەدا دیاری دەکا ، وەك :
سیامەند چوو بۆ دهۆك .
دهۆك ـ ناوی تایبەتی شارێکە لە دوای ئامرازی پەیوەندی‌یەوە کە (( بۆ )) یە هاتووە .
بایز بە قەڵانگ گوێزەکەی تەکاند
قەڵانگ ـ ناوە ... لە دوای ئامرازی پەیوەندی (( بە ))وە هاتووە .
٧ـ ناو ئەو وشەیەیە کە ئەو پاشگرو پێشگرو نیشانانەی کە دوکتۆر ئەوڕەحمان باســـی کردوون پێیەوە دەلکێن .
لێکۆڵەرەوە کە باســـی پاشگری رێزمـــانی « نیشانە » دەکات ، دەوریان روون دەکاتەوە ، لـــە توێژینەوەی پاشگری نیشتیقاقیشدا زۆری کردووە. بەڵام شتێکی سەرەکی کــــە لە یادی چووە ئەوەیە دەبوایە جێگای نیشانەو پاشگر کە بە یەکەوە بچنــە سەر وشەیەك روون بکردایەتەوە ... بـــە مانایەکی دیکە ئەگەر هاتوو نیشانە لەگـــەڵ پاشگردا بـــە وشەیەکەوە نووسان ـ جۆری پێوەلکانیان چـــۆن دەبێ‌و کامیان دەکەوێتە پێش یا پاشەوە !؟ .
گەلێك جار وا دەبێ نیشانەو پاشگر بەیەکەوە دەچنە سەر ناوێك یا ئاوەڵناوێك ، لەو حاڵەتەدا بچنە سەر هەر یەکێکیان ، پاشگرەکە راستەوخۆ بـــە ناوەکەوە یا ئاوەڵناوەکەوە دەلکێ ، ئەوجا نیشانەکـە دەچێتە سەریان . وەك لەو نموونانەدا :
لە وشەی (( باخچەکان ))دا
باخ ـ ناوە .
چە ـ پاشگری بچوك کردنەوەیەو یەکســـەر بەناوەوە نووساوە .
ەکە ـ نیشانەی ناسیاوی‌یە .
ان ـ نیشانەی ((کۆ))یە .
یا لە وشەی ((گردۆلکەکان))دا
گرد ـ ناوە .
ۆلکە ـ پاشگری بچوك کردنەوەیەو یەکسـەر بەناوەکەوە نووساوە .
ەکە ـ نیشانەی ناسیاوی‌یە .
بەناوەکەوە نووساوە .
ان ـ نیشانەی ((کۆ))یە .
یەکێکی دیکە لەو جوداوازی‌یانەی لـــە نێوان پاشگرو نیشانەدا هەیە ئەوەیە کە پاشگر ناوی سادە دەگۆڕێ بەشتێکی دیکەی وەك ناوی دارێژراو یـــا

ـوەلناو ، یا ئاوەلناو دەکا بەناوی دارێژراو یـــا ـوەلناو دارێژراو ، بەلام نیشانە لە جوستیو جمو حولی وشەکە ناگۆڕێو هەر بەناوی یا ئاوەلناوی ـمێنێتەوە . نموونە !

پاشگری «ی» دەچێتە سەر ئاوەلناو ، دەیکاتە ـری دارێژراو . وەك :

**کوێر ــ کوێری .**

**جوان ــ جوانی .**

پاشگر دەچێتە سەر ناوی سادەو دەیکا بە ناوی ـرێژراو . وەك :

**گۆزە ــ گۆزەلە**

**منداڵ ــ منداڵۆچکە .**

**ئاسك ــ ئاسکۆڵ .**

**کار ــ کاریلە .**

**نیشانەی ناسیاوی بچێتە سەر ناوی سادە ، هەر ـەناوی دەمێنێتەوە . وەك :**

**پیاو ــ پیاوەکە .**

**ژن ــ ژنەکە .**

کەمو کوڕیو ناتەواوییەکی گەورەی دیکەی ئەو ـکتێبەی دوکتۆر ئەوڕەحمان ئەوەیە کاتێ بەشەکانی ـرێزمان دەکا بە «١٠» دە بەشـــەوە لە ژمارە «٨ــ٩» هەشـــــتو تێدا ئامرازی پێوەنـــدیو ئامـــرازی ســەرسوڕمانو بانگهێشتن(١٢) بە دوو بەشی سەرەکی ـدەزانێ ، ئەوجـــا لە بەشـــی «١٠» دە هەمـــــدا « پارتیکڵ »یش بە بەشێکی سەربەخۆ دەزانێ ، بەلام ـێمە باوەڕمان وایـــە کــــە ئامرازەکانی پرســـیارو ســەرسوڕمانو پەیوەندیو پەیوەستو لەگەڵ ئامرازی ـیشانداناو .. « پارتیکڵ »ن ، ئەمە وای کردووە کە ـیەکێك بەکاری زمانەوانییەوە خەریك بێ نازانێ کــە ـدوکتۆر ئەوڕەحمان « پارتیکڵ » بەچی دەزانێ ، ڕەنگە ـئامرازەکان نەتوانرێ لــە یەکـــدی جیا بکرێنەوە ، هەندێکیان بە بەشی سەرەکی بزانرێو هەندێکـــی دیکەیان بە « پارتیکڵ » ، ئەو جۆرە دابەشــکردنەی دوکتۆر جگە لە دروستکردنی ئاڵۆزیو پەرتکردنی ـبیری زمانەوان چ حەقێکی دیکە ناگەیەنێ ، هەر لەبەر ئەوە هەموو ئەو کەسانەی کە ئامرازی پەیوەنـــدیو ئامرازی ســەرسوڕمان بەشتێکی ســــەربەخۆ دەزانن جێگای خۆی نییەو بلری سەرنجەکانیان پێویستیان بە پێدا چوونەوە هەیە .

لە کۆتاییدا زێدەتر ســــەرکەوتن بۆ دوکتـــۆر دەخوازینو چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەین .

**سەرچاوەو پەراوێزەکان :**

**(١) نوری عەلی ئەمین ، گرتنی کەلێنێکیتر لـــە ڕێزمانی کوردی ، چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا ، ١٩٥٨ .**

**(٢) دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، چاپخانەی .کۆڕی زانیـــاری کورد ، بەغدا ، ١٩٧٧ .**

**(٣) دوکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمـــانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکــەم ، ناو ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق ، بەغـــدا ، ١٩٧٩ .**

**(٤) سەعید صدقی ، مختصر صرفو نحوی کوردی، چاپخانەی نجاح ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ل/٩ .**

**(٥) توفیق وەهبی ، دەســـتووری زمانی کوردی ، دار الطباعە الحدیثە ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ل/٥٩.**

**(٦) نوری عەلی ئەمین ، قواعـــدی زمانی کوردی ، چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا ، ١٩٥٦ ، ل/٥٧ .**

**(٧) کاتێك ئەم باسەم لەگەڵ برایەکدا باس دەکرد ، برایەکی دیکە هاتو ژمارە /٧٧ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٩ی گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ »ی پێبوو ، برای یەکەم کە گۆڤارەکەی وەرگرتو پەڕەکانی هەڵدایەوە .. دوای ماوەیەك گووتی فلانی ئەم وتارە شتێکە لەو بۆ چوونەی تۆ ..! کە منیش تەماشام کردو خوێندمەوە برایەك بە نێوی کاك « ئاراس عەزیز عەبدوڵلا » وە بــە ناونیشانی « پریاسکەیەك سەرنج » چەنـــد ڕەخنەیەکی وردو زیرەکانـەی لەکتێبی زمانو ئەدەبی کوردی پۆلی پێنجەمی ئامادەیی گرتووەو هەندێ لایەنی ڕوون کردبۆوە .**

**(٨) سەعید صدقی ، هەر ئەو سەرچاوە . ل/١٤ .**

**(٩) هەر ئەو سەرچاوە ، ل/٢٥ .**

**(١٠) محەممەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایەك لـــە فیلۆلۆژی زمانی کـــوردی ، چاپخانـــەی مەعاریف ، بەغدا ، ١٩٧٤ ، ل/١٥٤ .**

**(١١) ا ــ دوکتۆر ئەوڕەحمان ، ڕێزمانی کوردی ، هەر ئەو سەرچاوە .**

**ب ــ دوکتۆر ئەوڕەحمـــان ، وشـــەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، هەر ئەو سەرچاوە .**

**(١٢) دوکتۆر ئەوڕەحمان ، ڕێزمانی کوردی ، هەر ئەو سەرچاوە ، ل/٨ .**

دکتۆر ابراهیم عزیز ابراهیم

# تێبینیێک لە عاست نووسین بە دیالێکتی سۆرانی زمانی کوردی

بە ئاوڕ دانەوەیەك لە پشت نووسین بە دیالێکتی سۆرانی زمانی کوردیو بەراورد کردنەوەی لە گەڵ نووسینی ئێستای بە تەواویو ڕوونو ئاشکرا بۆمان دەر دەکەوێ . کە نووسین بە کوردی لەم چەند ساڵەی دواییدا پەرەیەکی زۆری سەندووەو زۆر هەنگاو بەرەو پێشەوە چووەو کەوتۆتە نێو قەوارەیەکی ڕێكو پێكو پێشکەوتوو . ئەم پێشکەوتنەی نووسین بە دیالێکتی سۆرانی بەوەوە دیارە ، کە بە چەندان کتێب بەم دیالێکتە دەردەچێ زیاد لەوەش چەند گۆڤارو ڕۆژنامە ، کە بە زنجیرەی نەپچراوی حەڵقە لە دوای حەڵقە دەکەونە بازاڕەوە وەکو ، گۆڤارەکانی :

کۆڕی زانیاری کورد ، بەیان ، ڕۆژی کوردستان، ڕۆشنبیری نوێ ، هەروەها ڕۆژنامەکانی : هاوکاری ، بیری نوێ ، پاشکۆی عێراقو چەندان گۆڤارو ڕۆژنامەی تر ، لە لایەن خوێندکارو ڕۆشنبیرانو شوێنانی تر دەردەچن .

ئەو کوردیەی ، کە ئەم کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامانەی پێ دەنووسرێن ، بێ گومان پاكو پوخت ڕەوانو ئاسانە . ئەو خاسیەتانەی ، کە لە سەرەوەدا باسم کردن بوونەتە هۆیەکی سەرەکیو بنجی لە مەیدانی بڵاو بوونەوەو پەرەسەندنی نووسین بە کوردی ، بۆیە تا ئێستاش ئەم دیالێکتە بۆتە نەخشەی نووکی قەڵەمی نووسەرانو زمانەوانانی کوردو غەیری کورد .. لای غەیرە کوردەکانەوە دیالێکتی سۆرانی زمانی کوردی بەشێکی زۆری لە باسەکانیان گرتووە . هەر لە

یەکێتی سۆڤیەتەوە بگرە تا ئەگاتە فەرەنساو ئەڵەمانیاو بەریتانیاو ئەمەریکا .. هتد لەم وڵاتانەدا زمانەوانی کوردی دەمێکە پەیدا بووە زۆر کادیری زانستی زمان بەروەر خۆیان خەریکی فێر بوونی زمانی کوردی کردووە . بۆ ئەوەی لە ژێر سێبەری زانستی زمانەوە لێی بکۆڵنەوەو بنجو بناوانی زمانی کوردی بخەنە سەر پانی دەستو پیشانی جیهانیزانیاری زمانو خەڵکی بدەن ، ئەم زمانەوانانە یان ئەو غەیرە کوردەی، کە خۆی فێری زمانی کوردی دەکات وە بۆ گەیشتنە ئەنجامی کارەکەیان پێویستیان بە ووشەیەك هەیە ، کە لە کوردستاندا دەنووسرێتو دەکەوێتە ڕوو . جا بۆ ئەوەی مەبەستی ئەم ووتارە ڕوون کەینەوە دەبێ بگەڕێینەوە سەر نووسین بە کوردی ، نووسین بە کوردی دەمێکە دوو ڕێگای گرتۆتە بەر یانی کوردی بە دوو گرافیکا دەنووسرێت ، گرافیکای لاتینیو گرافیکانی عەرەبی ، هەر دوو گرافیکایەکەش بۆ زمانی کوردی دەشێن ، هەرچەندە گرافیکای لاتینی بۆ نووسینی کوردی لێهاتوو ترە لە هی عەرەبی ، بەڵام لە گەڵ ئەوەش گرافیکای عەرەبی خزمەتێکی زۆری زمانی کوردی کردووەو گەلێك پێشی خستووە .. وە نەبێ لە ڕۆژهەڵاتدا هەر زمانی کوردی بە گرافیکای عەرەبی بنووسرێت ، بەڵکو زمانی تریش هەن ، وەکو فارسی، پوشتوو .. هتد ، ئەم گرافیکایە بەکار دێنن .

ڕێکخستنی دەنگو واژەکانی کوردی بە گرافیکای عەرەبی زمانی کوردی ناسك کردووە بۆیە کە زەرەیەك نووسینی کوردی بەو گرافیکایە لە یاسای خۆی چووە دەرەوە یەکسەر کار دەکاتە سەر تێکچوونی واتای پیتو ووشەکان دوا بەدوای ئەوەش مانای ڕستەو ناوەڕۆکی نووسینەکە دەگۆڕێت ، جا لەبەر ئەوەو بەو پێیەی کە من شارەزای نووسینی کوردیمو فەرامۆش نەکردنی ئەو بێگانانەی ، کە خۆیان فێری زمانی کوردی . دەکەنو . کوردی دەخوێنەوە بۆ دووپات کردنەوەی جۆرەها پرسیار لە زمانی کوردیدا بۆ کەڵکی زمانی کوردی خۆی یان بۆ کەڵکی ئەو زمانانەی ، کە بەهۆی زمانی کوردیەوە پرسیارەکانی وەڵام دەدرێنەوە ، دەڵێم ، ئێمەی نووسەرانی کورد ، کە بە کوردی دەنووسینو گرافیکای عەرەبی لەم نووسینەدا بەکار دێنین دەبێ بیر لەوە بکەینەوە ، کە نووسینی ئێمە تەنها هەر بۆ کوردان نیە ، کە لەبەر ئەوەی کوردن هەرچۆن بنووسیت تێدەگاتو گیروگرفتی نیە ، بەڵکو دەبێ پێشەکی ئەو غەیرە کوردانەش ، کە فێری زمانی کوردی بوونو کوردی دەخوێننەوە فەرامۆش نەکرێن، چونکە خوێنەنەوەی خوێندەوارە کوردەکە یان غەیرە کوردەکە بەندو بەستراوە بە جۆری نووسینو ئیملای نووسین بە کوردی ، گەر ووشەکە بە هەڵە نووسرابێ زۆر جار هەیە بە هەڵەی دەخوێنێتەوە ، ئەو خوێندەوارە بێگانە کە وەك خوێندەوارێکی کورد وا شارەزای زمانی کوردیو نووسینی نیە ، کە بتوانێ پیتو ووشە بەهەڵە نووسراوەکان لێك جودا بکاتەوە ، ئەمە وەنەبێ هەر سەر لە خوێندەوارە بێگانەکە بشێوێنێ، جا لەبەر ئەوە خوێندەوارە بێگانەکە پەنا دەباتە بەر فەرهەنگ ، بەڵام فەرهەنگیش بە هەنای نایەت ، چونکە ئەوەی ڕاستە لە فەرەهەنگدا دەبێت ووشەکانی ناو فەرهەنگ لە ووشەکانی سەر کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامە پاکترو پاراوترو ڕاستر بنووسرێن . لەبەر ئەوە ئەو ووشەیەی ، کە بە هەڵە نووسراوە لە فەرهەنگیش نایدۆزێتەوە وا لە غەیرە کوردەکە دەکات ، کە بە هەڵە ووشەکە تێبگاتو بە هەڵەش ڕوونی دەکاتەوەو لێی دەکۆڵێتەوە ، ئەمەش زیان بە زمانی کوردیو لێکۆڵینەوەی دەگەیەنێ .

ئەم ووتارەش ڕامدەکێشێتە سەر دەرخستنی هەندێك تێبینی ، کە بەرچاو کەوتوون لە نووسینی کوردیداو وام لێ دەکەن کە بە گیانێکی دڵسۆزیەوە داوا لە نووسەرانی کوردی بەڕێز بکەم ، چاو لە تێبینیەکانم نەقوچێننو نەپۆشن بۆ ئەوەی ئەو هەڵانەی ، کە لە خوارەوەدا باسیان دەکەم ، ئەگەر هەڵەی چاپی بن یان هی بە سەراچوونی خودی نووسەرەکە بن لە نووسینی نەمێنن .

لە زۆربەی نووسینەکاندا دەبینم ، کە نیشانە « ٧ » ی سەر پیتەکان « و ، ی ل ، ر » کە پیتی « ۆ ، ێ ، ڵ ، ڕ » دروست دەکات فەرامۆش دەکرێتو ناخرێتە سەر پیتەکان ، ئەمەش واتای ووشەکان دەگۆڕێ . بۆ نموونە : گەر نیشانەی « ٧ » لەسەر پیتی « و » ی ووشەی « بۆن » دا نەنووسرێت ووشەی « بون » دروست دەبێ جا ووشەی « بۆن » واتای « بۆ = رائحە » دەگەیەنێ ، بەڵام ووشەی

« بون » ئەمەیان فرمانێکی یارمەتی دەرە لە زمانی کوردیدا ، زۆربەی نووسەران ئەمە بە یەك « و » دەنووسن کەچی دەبێ بە دوو « وو » بنووسرێ ؟ هەروا گەر هەمان نیشانە لەسەر هەمان پیت لە وشەی « خۆ » ، کە ڕاناوی خودی‌یە لە زمانی کوردی‌دا دەبێتە وشەی « خو » ، کە واتای ڕەووشت دەگەیەنێ ، هەروا لە وشەی « کۆڕ » دا ، کە واتا دیارە بەبێ نیشانە دەبێتە « کوڕ » ، کە واتا کەی گەلێ لە واتای « کۆڕ » جیایە . هەمان شت لە وشەی « بۆق » کە ئاژەڵێکی ئاوییە ، بەبێ نیشانە دەبێتە « بوق » کە ئامێرێکی مۆسیقایە بە عەرەبی ، هەروا لە وشەی « بۆز » دا ، کە واتای بە عەرەبی « اشمط ، اشهب » دەگەیەنێ بەبێ نیشانە لە سەر پیتی « و » دەبێتە « بوز » کە واتای سەهۆڵ دەگەیەنێ لە ناوچەی هەولێردا .

ئەم نیشانە « ٧ » لە سەر پیتی « ێ » لابرێ کاردەکاتە سەر گۆڕانی واتای وشە یان بەخشینی واتا ، بۆ نموونە ، گەر لەسەر وشەی « ڕێز » ، کە واتای « احترام » دەگەیەنێت لابرێ وشەی « ڕیز » دروست دەبێ ، کە واتای « صف » دەگەیەنێ، هەروا لەسەر پیتی « ێ » ی وشەی « خانووێ » ، کە واتای « خانووێك » دەگەیەنێ لە حاڵەتی نادیاردا وشەی « خانووی » دروست دەبێ بە واتای خانووی ئەو ، هەروا لە وشەی « زێ » = ڕووبارێکی گەورە، وشەی « زی » دروست دەبێ ، بەواتای یەخە یان زیی کراس .

لە وشەی « ڕێزان » ، کە ناوی گوندێکی ناوچەی باڵکە لە سەر جادەی حاجی ئۆمەران وشەی « ڕیزان » دروست دەبێ کە هیچ واتا نابەخشێت . هەروا لە وشەی « بێ » کە ناوی « بەهێ » یە لە ناوچەی هەولێردا بەکار دەهێنرێ وشەی « بی » دروست دەبێ ، کە جۆرە درەختێکی بچکۆلانەیە لە چەم‌و ڕووباران دەڕوێ .

هەمان نیشانە گەر نەخرێتە ژێر پیتی « ڕ » لە وشاندا ، هەروا کار دەکاتە سەر وشەکان . بۆ نموونە : لە وشەی « گڕ » دا بەواتای گڕی ئاگر وشەی « گر » دروست دەبێ بەواتای خۆڵ لە ناوچەی هەولێردا بەکار دەهێنرێ ، لە وشەی « دڕ » دا کە واتای تووڕەیی‌و دڕی دەگەیەنێ وشەی « در » پەیدا دەبێ . بە واتای « دل » لە زاراوەی ناوچەی هەولێر دا لە وشەی « سووڕ » واتای « خول » دەگەدەگەینی وشەی سوور پەیدا دەبی لە وشەی « کوێر »ووشەی « کور » دروست دەبێ ، کە واتای گوێر ، ئاو گەرم کردن بۆ جل شوشتن ، ڕوخان دەگەیەنێ لە ناوچەی هەولێر موکریدا . لە وشەی « تێڕ » دا ، کە گونێیکە لێك دەدروێ‌و گڵ‌و چەقڵ‌و زیخی پێ دەکێشنەوە بە وڵاخ ، وشەی « تێر » دروست دەبێ بەواتای « تێربوون » .

هەروا لابردنی هەمان نیشانە لەسەر پیتی « ڵ » ، کار دەکاتە سەر وشان ، بۆ نموونە ، لابردنی لەسەر پیتی « ڵ » لە وشەی « ماڵ » دا وشەی « مال » دروست دەبێ کە وشەیێکی عەرەبیە ، لە وشەی « چڵ » کە واتای چڵی دار دەگەیەنێ وشەی « چل » دروست دەبێ ، کە ژمارەیە . لە وشەی « بەڵا » وشەی « بەلا » دروست دەبێ ، کە هیچ واتا ناگەیەنێ ، هەروا لابردنی نیشانە « ٧ » لەسەر پیتەکانی « ێ ، ڵ » لە وشەی « خێڵ » وشەی « خیل » دروست دەبێ ، کە زۆر دوورە لە وشە کوردیەکە .

سەرەڕای ئەم تێبینیانەی ، کە لە سەرەوە باسم کردن شتێکی تریش زۆر زۆر دەکەوێتە بەر چاوو ئەویش ، ئەوەیە ، کە پیتی «وو» بە «و» دەنووسرێت، ئەمەش هەڵەیەکی ئیملایی‌و ڕێزمانی گەورەیە ، بۆ نموونە وشەکانی : بوون، چوون، دەروون، نووسین، سوون ، شووتی .. هتد بەم جۆرە دەنووسن : بون ، چون ، درون ، نوسین ، سون ، شوتی . ئەمەش ئەوەی بیەوێ خۆی فێری زمانی کوردی بکات بۆ ئەم جۆرە وشانە بە هەڵە فێر دەبی .

ئەمەو هەندێ تێبینی تریش لە چەند ووتارێکی تر پیشانی دەدەین .

# مەقامە تایبەتیەکانی کورد



**رزگار خوشناو**

**بیشـەکی**

مەقام یا بە کوردی کەبێی دەڵێن ( هەستان ) یا ( هەوا ) ، شیوەیەکی تری موسیقایەو جوریکی کۆنە ،مەقام تەنیا تۆنی هەیەو بێ ڕەوتـە ( رذم ) ، سکێلو پلەیەکی تایبەتی خۆی هەیەو شوێنی دەست پێکردنو کۆتایشی هەیە .

مەقامی تەواو بریتیە لە ( هەشت ــ ٨ ) دەنگو دەنگی هەشتەم دووبارە کردنەوەی دەنگی یەکەمـە بەرەو بەرزی وەکو لە ( لا بۆلا ) . زور مەقامیش هەن تەنانەتە ناگەنە هەشتەمین دەنگ وەکو لە ( لا بومی یا بورێ ) ، مەقامی واش هەیە کە لەپلەی هەشتەم تیپەر ئەبیو ئەگاتـە پلەی نۆیـەمو زیاتر وەکـو ( لا ــ لا ــ می ) .

هەر مەقامێك تامو چیژی تایبەتی خۆی هەیەو ناوێکی سەرەکی دیاری هەیە .

هـەر چەنـدە ژمارەی مەقامـەکان زۆرە ونایەتەژمێر ــ وەکو فارابی نزیکەی (١٥٠٠ ) مەقامی دۆزیوەتەوە ، بەلام بەشێوەیەکی زانسـتیو بەلای منەوە ١٠ ــ ١٥ سەرەکی زیاتر دەرناچن . وولاتانی رۆژ ئاوادەمێکـە خۆیان لـەم گـەرەلاوژە فورتار کردووەو مۆسیقایان بەگشـتی کردۆتە دوو بەش ( مەقامی گەورەو مەقامی بچوك ) یا ( مجرو ماینر ) دوو سێ بەشیش لەم دوو بەشـە جیـا دەبێتەوە . بەڕاستی ئەو هونەرمەندو زانایانەی لە مەقامات ئەکۆلنەوە توشی گیژیو سەر لێشتواوییەکی تەواو دەبن بە هۆی ئەو ناوە زۆرانەی کە لەمەقامەکان نراون ، بو وێنە مەقامی نەهاوەند چوار پێنج مەقامی لی وەرگیراوە لە بەر ئەوەی کەهەریەکی لە پلەیەك وەرگیراونو یەك دوو جیاوازی ساکاری هەیە ئەوا ناویان لێ ناون ( بۆسلیك ــ فرحفزا ــ سلتانی یکاه لە ڕاستیشدا هەر مەقامی نەهاوەندن .

تا ئێستا زۆر کونگرە دەربارەی مۆسیقای روژ هەلاتی بەستراون ، بەلام بە داخەوە تا ئیستاش نەیان توانیوە خۆیان لەم ئالوزنییە رزگار بکەن .

گومان لەوەدا نیە کە هەر بەشێك لەم بەشانە جیاوازییەکیووردی هەیەو تامو چێژیکی تایبەتی

لی بەدی دەکری ، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنی کە ناوێکی تری لێبنرێتو بەمەقامێکی سەربەخوو سەرەکی لە قەلەم بدرێت ، بەلکو ئەبێ بوو ترێ فلان بزوتنەوە لەفلانە مەقام ( کە سەرەکی‌یە ) .

مەقامە کوردیەکانیش هەر لەو بابەتەن‌و لەمەقامە سەرەکی‌یەکان جیا دەبنەوە بەلام لە کوردەواری خۆمان وەکو مەقامێك ناسراوون‌و مۆرکی ڕەسەنایەتی‌یان بە شێوەیەکی رون‌و ئاشکرا پێوە دیارە ، بو وێنە مەقامی ئەلله وەیس (نەهاوەندە) بەلام سێ بزوتنەوەی تێ هەل دەکەویت‌و جۆری ووتنی لەگەل مەقامی (نەهاوەند) زۆر جیاوازە . هەر جەندە وەکو ووتم (من لەگەل ئەوە نیم کە مەقامێکی سەرەکی گەر ۳. بزوتنەوەی هەبو ئەوا هەر یەکە ناوێکی تایبەتی هەبی‌و دیسان بەمەقامێکی سەرەکی لە قەلەم بدرێت )

دیاردەیەکی ئاشکرایە کە کوردیش ، وەك هەموو نەتەوەیەکی تر ، مۆسیقاو گورانی تایبەتی خۆی هەیە کە مۆرکی نەتەوایەتی‌یەو ناسنامەی هونەری ئێمەیە ، هەر یەکێك لە لقەکانی چلە پۆپەی گورانی کوردیش رەنگ‌و بوو جەشەی تایبەتی خۆی هەیە .

ئەگەر بەووردی لە گورانی کوردی سەرنج بدەین، ئەو راستی‌یە ڕوون دەبێتەوە ، کە هەر ناوچەو هەریمێك لە کوردستانا بە گوێرەی باری تایبەتی خۆی ، مۆسیقاو گورانی‌و شیوازی خۆی پێوە لکاوەو سروشتی ئەو هەرێمەی پێوە دیارە .

لەم باسەدا پەنجە بو ( مەقامی ) کوردی درێژ ناکەم بە کورتی ، چونکە لە تواناداا نیە لەم دەرفەتەدا بچینە ناو ناخی بابەتەکەوەو شیکردنەوەی هەر مەقامێك ماوەیەکی دوورمان بۆ دروست ئەکات .

مەقامی کوردی دوو شێوەی ئاشکرای هەیە ، واتە ( لاوك‌و حەیران ) ، کە یەکەمیان مۆرکی ناوچەی ( بادینان‌و ) دەورو پشتی وەرگرتووە ، بەشی دووەمیشیان ناوچەی ( سۆرانی ) گرتوتە باوەش .

**پێناسینێکی کورت : ـ**

لاوك / لە شیوەی ( مەلحەمەیەکی ) شیعری دایەو گەلێ دیاردە ئەخاتە ڕوو ، لەو دیاردە هەرە دیارانە مەسەلەی دلداری‌و کێشەی شەڕو شوڕو هەلوێستی ئازایەتی پیاوە چاو نەترس ودل قایمەکانی کورد دەکات‌و لە سەردەمێکی دیارداو دەیگرێتەوە ، وە بەشێوەکی کاریگەر بە مەقامی ( بەیات ) دەگوترێت، جار جاریش بەمەقامی حجاز ) .

بە هەموو سکێلەکانی موسێقاو بەگویرەی بلندی‌و نزمی دەنگی لاوك بیژەکە ئەووترێت .

زوربەشی هەیە وەکو ( خەلیلۆ ـ مەترانۆ ـ حوسەینی ـ عەبدالی کوردۆ ) دووایشیان بە دیارترین بەشەکانی ئەدرێتە قەلەم .

لاوکی کوردی ، چەشەیەکی پر خوشەویستی‌و ڕەنگ‌و تام‌و بۆی تایبەتی لە دلی گویگردا هەیەو لە ئەنجامی ئەو بزوتنەوە بەردەوامەو ئاوازە هەمە چەشنە ئەکەر چی دووپات دەبێتەوە ، بەلام بەردەوام شیعرەکە ، واتە رووداوی لاوکەکە لە گوران دایەو زنجیرەی مەلحەمەکە ناپچرێ ، بۆیە گویگر بەتەواوی لەگەل بەسەر هاتەکەدا ئەژی‌و نیکەران‌و بێزاری ناکات . بکرە دەماو دەم ئەتوێتەوە لەگەلیاو خۆشەویستی لەگەل ڕووداوەکەدا قول‌تر ئەبیتەو ، تەنانەت زۆر کەڕەت دەنگی گورانی بێژەکەش هیچ چەشنە تام‌و بۆیەکی تێدا نیە ، بەلام لاوکەکە ڕووداوێکی هیندە دل تەزێنە ، هیندە بە سوزو خروش‌و نیکەرانە ، هیندە پڕ لەهەلوێستی سەیرو شیرینە ، کە بەتەواوی دلی گویگر خاو ئەکاتەوەو کەفوکۆی بی کۆتایی تێدا جێ ئەهێلی .

چ مالێك هەیە لە ناوچەی سەرودا ! بەتایبەتی لەم دەشتەی ( بادینان ) لاوك بیژێکی تیدا نەبێ ! : جکە لەوە سروشتی هەرێم وای لە خەلکی کردووە ، هەر خۆی لە خۆیدا مۆسیقای خوش‌بوێ ، تەنانەت زوربەیان دەستێکی بالایان لە دروست‌کردنی چەندە ئامێریکی مۆسیقا هەیە وەکو ( تەمبور ـ بزق ) کە ( پەسەند ) ترین ئامێری ئەو هەرێمەیە بەتایبەتی لەگەل لاوك .

دیارترین دەنگ خۆشەکانی لاوك بێژی لەم ناوچەیەدا ( سعید اغا جزراوی ـ کاویس اغا ـ محمد کلوری ـ مریەم خان ـ علی جزراوی ـ علیکو ) ـ یە کە کوجی دووایان کردووە ، لەوانەی ئەم سەردەمەش ( حسن جزراوی ـ مەحەمەد عارف جزراوی ـ عیسی برواری ـ خلیل عقراوی ـ عایشەشان ـ کولبەهار ـ تحسین طه ـ حسن علی خنجر ـ خلیل باکوزی ـ یوسف عبو خرتۆ ) وەهەندێ دەنگ خوشی تر کە بەرهەمیان لە ئێسگەی کوردەی هەیە .

**حەیران : ـ**

ئەم شێوەیە تایبەتە بە ناوچەی ( سۆران ) ، بە

تایبەتی لەم هەرێمانەدا بنجی خۆی داکوتاوەو بووە بەزمانمالی خەڵك : ـ ( دەشتی هەولێر ـ بەشێك لەخۆشناوەتی ـ بەشێك لە هریمی بشدەر ) .

ڕستەکانی حەیران ڕەوتی شیعری تەواوی‌نیە ، لەمەدا باس لە دلداری‌و وەسفو جوانی‌و شوخ‌و شەنگی ئافرەت‌و سروشت‌و کەلچەری نەتەوەی کورد ئەکریت .

وە هەروەها بەشیوەیەکی گشتی‌و لە قالبێکی تەرزو پڕ لە سۆزی خەیالی‌و دلگیری کە بەتەواوی گوێگر ئەخاتە دەریای خوشەویستی‌و ژیانێکی نوێ‌ی تر ، ئەگەر چی زۆر جار لە ناواخنی ووشەکانیشی حالی نەبیت ، بەلام هینده بەسوزە ، بەتەواوی مرۆڤ گیرودەی خۆی ئەکات‌و هەستی ڕائەکێشی بەلای خۆی‌دا .

لەم چەشنە مەقامە ، زیاتر ـ هەلبەست ـ بناغەی خۆی‌دا ئەکوتی ، وە زۆرترین ووشە بە ئاوازی دلگیر دەردەبڕێت ، گرنگ لێرە ئەوەیە کە ڕستەکانی هەلبەستەکە پەیوەندی‌یەکی تونلو تۆلی بێ‌ئەندازەی‌لەگەل یەکتردا هەیەو مانای هەرگیز تێك ناچێت‌و نابچڕێ هەر چەندە سوك بووتریت . و ئەو مورکە خوی وون ناکات‌و لە بناغەدا خۆی حەشار ئەدات .

یۆمان هەیە حەیران بکەین بەسێ (٣) بەشەوە :

**یەکەم** ـ سەر چیایی‌و ( ناوچەی تیرەو هۆزی خوشناوەتی ) . کە شەقلاوەو هیران‌و هەریرو سەلاحدین دەگرێتەوە .

**دووەهەم** ـ بشدەری ( ناوچەی کۆیەو ڕانیەو قەلادزێ ) دەگریتەوە .

**سی‌هەم** ـ حەیرانی دەشتی هەولیر ( کەتایبەتە بەتیرەو هۆزی ) ( گەردی‌و دزەیی ) .

ئەم تەرزە مەقامە شیرینەش هەم دیسان بەشیوەی مەقامی ( بەیات ) ئەووترێت‌و . دوو بزوتنەوەی سەرەکی تێایە : ـ

١ـ هاتو چۆ کردن لەسەر پلوی‌بنچینە (اساس) ( تونیك ) وە بەرزبوونەوە تاپلەی ری ئەگەر لەسەر تەبەقەی ( لا ) ووترا .

٢ـ دەست پی‌کردن لەسەر پلەی پێنجەم ( دومینات ) پاش ئەوەی تێر لە بزوتنەوەی یەکەم دەمێنێ‌و دووایی ئەگەرتێەوە بو بزوتنەوەی یەکەم .

شۆرە سوارەکانی حەیرانیشیان ووتوە ئەوانەن



( خوالی خوشبو عوسمان حەیران ـ ماموستا رسول بێزار گەردی کە بەنرخترین سەرچاوەی ئەو مەقامەیە ـ محمەد ئومەراوەیی ـ عمر ئومەراوەیی ـ حەسەن سیساوەیی ) .

**٣ـ مەقامی ئەللەوەیسی :ـ**

ئەم مەقامە بەتەواوترین کوردی لە قەلەم دەدرێت ، تایبەتە بەکوردو رەنگ‌و بۆ مورکی رەسەنی کوردەواری بەئاشکرا پێوەدیارەو چەشەیەکی نزیکی بەکوردەوە هەیە ... شێوەی شعری ئەم مەقامە ( گۆرانی‌یە ) هەلبەتە زیاتر بە شیعری ئەم شاعیرانە دەووترێت :ـ ( مەولەوی ـ وەفای ـ بێسارانی ـ سەیدی ـ خانای قوبادی ) دیارترین مەقام بیژەکانی ئەم مەقامە بریتین لە ( شیخ نوری شیخ صالح ـ محمد امین تالەبانی ـ عزیز امین ـ علی مردان ـ محمد صالح دیلان ) لە گورانی بیژەکانی تازەش ( حسین علی ـ محمد جەزا علی ـ حەسەن گەرمیانی ـ خلیل وەندی ) .

ئەللەوەیسی سێ بزوتنەوەی دیار ئەگرێتە خۆی‌و بە مەقامی ( نەهاوەند ) ئەووتری : ـ

بزوتنەوەی یەکەم ـ ئەگەر هاتو مەقامەکەمان لەسەر دەنگی ( لا ) وەرگرت ئەوا لەپلەی ( می ) ( می ـ لا ـ می ـ لا ) بەووشەی ( ئازیزم ) دەستپێ دەکات دووای سێ چوار جار ئەم بزوتنەوەیە

ئەووترێو ئەچێتە بزوتنەوەی دووهەم .

٢ـ بزوتنەوەی دووەمیش لە پلەی ســــێ دەستپێ دەکات ( سی ـ دو ـ ری )و لەسەر دەنگی رێ ئەوەستیتو ئەگەڕێتەوە تا سێ چوار جار ئینجا بۆ بزوتنەوەی سێیەم . بزوتنەوەی سێیەم .

٣ـ لەپلەی دۆ دەست پێ دەکات ( دۆ ـ ری ـ می )وە لەسەر دەنگی می ڕادەوەستێو شـــێوەی مەقامەکە ئەبیتبە ( عەجەم ) ودووای سێ چوار جار هەستان . بێگومان لێرەدا ئەللـــەوەیس گرانترین بەشی دەستپێ دەکات بەتایبەتی ئەگـــەر هاتـــو مەقامەکە لەسەر پلەیەکی بەرز بگوترێت ـ بۆیـــە زوربەی گورانی بێژان ناتوانن خۆیان لەم مەقامەبدەن لەبەر ئەم بزوتنەوەی دووایی . دووای بزوتنەوەی سێیەم ئەگەرێتەوە بو ( بوشوینی دەست پێکردنی ).

**مەقامی هیجران : ـ**

مەقامێکی دیکەی کوردە ، بە شیعری ئاسایی دەگوترێتو تامو بۆی ڕەسەنی کوردی پێوە لکاوە . بەسکێلی مەقامی ( بەیات ) دەگوترێت ، سوزو جۆرە لاواندنەوەکی زۆر بەجۆشی تیایە بە تایبەتی لـــە لەحالەتێکی وادا کە بەدەنگێکی بە سۆزو دلگـــیری کوردانە بوترێو بە چەشنە هەوایەکی بەرزو ناسك .

**قـــەتار : ـ**

هاموشۆی لەگەل ئەللەوەیسیدا نزیکە ، لەبەر ئەوەی کە بەهەمان مەقامی ئەللەوەیسی دەگوترێ کە ( نەهاوەندە ) وە بەجوتە پێکرا ناو دەبرێن ، وئەم مەقامەش شـێوەیەکـی زور بەتامو نایابی هەیـەو ڕەسەنایەتی تەواوی کوردەواری تیادا بەدی دەکرێت.

مەقامی ( هەمایون ) ( الوند ) ( خورشیدیش ) ( سەفەر )

مەقامی تریکوردنو شیوەی ووتنیان بەئاشکرا مۆرکی ڕەسەنایەتی کوردییان پێ وەیە ، جگەلەوە .. کورد زۆر مقامی تری هەیە ، بەلام مەخابن ، زۆربەی ئەو مەقامانە بە پاکیو ڕوونیو ئاشکرایی نەگەیشتۆتە دەستمانو دەستو برد شێ نەکراونەتەوە ، وەکوە :ـ

( غەمەنگیز ـ نیوەشـــەوی ـ خـەوخوش ـ رەنجوری ـ شوشتەر ـ سیاچەمانە ـ خاوکەر ـتاد)

هۆی ئەم دەست کورتیەش بەڕاستی لەم خالانەی خوارەوە کۆدەبنەوە : ـ

١ـ نەبونو قاتو قڕی کەرەستەکانی تۆمارکردن.

٢ـ مال ئاوایی کردنی زۆربەی ئەو مەقام بیژانەو ئەو کەسانەی پسپوڕییان لەم مەقامـــەنە هەبووە .

٣ـ نەبونی موسیقا ژەنو لێزانی ئەوتۆکە بتوانێ نۆتەی ئەو مەقامـــە کوردییە بەسۆزانـە بنوسێتەوە .

کورد ، بەش بەحالی خۆی دەولەمەندە لـــە کەلچەری نەتەوایەتی خوی ، وە بەتایبەتی مـــەقامی کوردی، کەژانو هەول دانو چەوسانەوەی بێ سنوری بە جەرگانەی ئەم میلەتەی پێوە دیارە . زۆر جاریش مەقامەکە ئەگەر جی کوردی پاك نیە ، بەلام لەزدتـی کوردەواری بە تەواوی پێوە لکاوە ... بەلام لـــە ئەنجامی هاتنە پێشەوەی گەلی قورکی هونەریو لێ هاتوو کە بەتەواوی لەژانی هونەرەکەدا تووانەوە . ئەم ( قورگە ) باکو کوردەوارییانە ، مەقامەکانیـان هیناوەتە ریزی سروشتی کوردی .. ئەمەش خوی لە خویدا کردەوەیەکی داهینەرانەیەو لانکی مەقامی کوردی هەژاندووە .

کـــە مروف گوێ لە بارچـــە مەقامێکـــی ( هونەرمەندی خوالێ خوشبوی کورد ( حسن زیرك ) شل دەکات سەری لـــە بەهرەی داهینانەکـــەی سوڕدەمێنی .. ئەچێتە جیهانێکی ترو خۆی لــە بیر دەکات ..

قورکی ( سیوە ) و ( ماموستا تاهیر تەوفیق ) یش هێچ دریغی یەکیان بو هونورو مەقامی کوردی هەرگیز نەکردووە .. بە دەنگە بە سوزو کاریگەرەکەیان باغی هونەری کوردییان رازاندۆتەوەو .

هەروەها زۆرانی تر دەنگە خروشەکەی خویان کردۆتە دیاریو وەکو بولبولێکی خوش ئاواز مالی هەموو کوردێك دەکەنە بەهەشتو وەکو گولە نەرگزو شیلانو کنێر لوتکەی هەموو شاخەکانی کوردستان دەڕەنگێنن ( دەنگە تیژە شاخاوییەکەی سەید عەلی ئەسغەر ی کوردستانی ـ رازونیانو قەتاری محمـــدی ماملی ـ لاواندنەوەو لایە لایەی مەزهەری خالقی ـ دەنگـــە کاریگـــەرە کـــەی محمـــد صالح دیـــلانو ـ داودو فیفانو قەدەری باری عایشە شان ـ دەنگی عەزیزو شاروخیو رەفیق چالاکو احمد محمودو .. هتـــد ) .

لە گوێی هەمو کوردێكو هەموکاتی ئەزرنگێنەوە وەکو مومێك ئەسوتێن بۆهونـــەری کوردی دەورو بەریان ڕووناكو بەشەوق دەکەن .



# ئەستێرەكان دروست دەبن و لەناو دەچن

ناصح فاتح عثمان وەری گێڕاوە

**چاكترین تیۆرییەكانی بنچینەی گەردوون ئەوە دەسەلمێنن كە سەردەمێك هەبووە گەردوون تیایدا ساردو تاریك بووە . لەم كاتەدا گەردوون تەنیا لە گازو كەمێك تۆز ( نەك وەك تۆزی ئێستا ) پێكهاتبوو. ئەم گازە نەگونجێ بەزۆری لە هەندێ شوێندا كۆبووبێتەوە كە لەوەودوا گالاكسی(۱) ( مجرات ) دروست كردووە .**

**بە شێوەیەكو بە وەسیلەیەك كە بە تەواوی نایزانین بەشێكی بچووك لەم هەورە گەورەیە جیا بۆتەوەو دەستی بە چوونە یەك كردووە . هەتا دەچووە یەك خەستییەكەی زیاتر دەبووو گەرمایی‌و پەستان لە ناخیدا دروست دەبوون . بەم جۆرە ئەستێرەیەكی سەرەتایی دروستبوو ، واتە بارستاییەكی مادی لە رێگەیدا بۆ ئەوەی ببێت بە ئەستێرە . وردە وردە ئەم بارستاییە خرە زیاتر ئەپەستێورا تا خەستییەكەی گەیشتە رادەیەك ئاگری ناوكی ( النار النوية ) بتوانێت دایگیرسێنێت . بە روودانی ئەمە پێكهاتنی یەكەم ئەستێرەكان تەواوبوو كە ئیتر لافاوی رووناكی‌و تیشكییان بە تاریكایی گەردوونی ساردا بڵاوكردەوە .**

بێگومان ئەوە نازانین كە ئاخۆ لە سەرەتاوە یەك ئەستێرە دروست بووەو پاشان دوایماوەیەك یەكێكی تری بەدوادا هاتووەو ئینجا بە تێپەڕینی كات ئەستێرەیەك بە دوای یەكدا هاتوون ، یان ژمارەیەكی زۆر ئەستێرە لە هەمان كاتدا دروست بوون ! بەڵام ئەوە دەزانین كە ئەگەر تیۆری گەورەترین تەقینەوە (نظرية الانفجار الاعظم)(۲) راست بێت لە لێكدانەوەی بنچینەی گەردووندا ئەوە پێویستە سەردەمێك هەبووبێت گەردوون هیچ ئەستێرەی تیادا نەبووبێ پاشان بەو شێوەیەی باسمان كرد دروست بوون ـ هەر لەو كاتەوە زۆر ئەستێرە دروست بوون‌و هەندێكیش لەناو چوون . ئەشێ ئەوە گومانی تێدا نەبێ كە هەندێ ئەستێرە دروست دەبن‌و هەندێ تیا دەچن . ئەم كردارەش بەردەوام دەبێ هەتا ئەو كاتە گریمانە یییە ( الزمن الافتراضی ) دێت كە مادەی نێوان ئەستێرەكان ( مادة مابين النجوم )(۳) بە تەواوی كار دەبێتو هیچ مادەیەك نامێنیت ئەستێرەی لێ

دروست بکرێت !

**ئەنجی بە بەکار هێنانی یاساکانی فیزیا بزانین چی روو دەدات پاش ئەوەی هـەورێکی سەرەتایی پێکهاتوو لە گازو تۆز دەست دەکات بە چوونە یـەك بۆ ئەستێرەیەکی سەرەتایی . بەلام رێگری گەورە لە تێگەیشتنمان بۆ دروسـت بوونی ئەسـتێرە ، دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی هۆیەکی مەنتیقی بۆ دەست پێکردنی یەکەم چونـەیـەکی مادە . هەرچەنـد ئەشگونجێ ئەم دەست پێکردنە ئەو پەری سـاکار بووبێت وەك ئەوەی لەرینەوەیەك درابێت بە هەورەکەو ئەویش لە شێوەی هەورێکی یەکەمیدا یەکی گرتبێت . بەلام ئەمەش پرسیارێك دەربارەی چۆنێتی دروست بوونی ئەو لەرینەوەیە خۆی هەلدەسێنێ ! دەربارەی چۆنێتی رووداتی چوونەیەکی سەرەتایی گۆسپێکی تر ناتەواوی زانیاریمانە .**

لە ژماردنەوە ئاشـکرایەکە هێزی کێش‌کردنی ئەتۆمەکان لەوەی چوونەیەك ئەبەوێ نزیکەی پێنج جار لاوازترە .

یەکێ لەو بیردۆزە کۆنانەی باسی چۆنێتی لەیەك نزیك بوونەوەی ئەتۆمەکانو زیاد کردنی بارسـتایی هەورە بچووکەکە دەکات پشت بە پەستانی تیشـك دەبەسـتێ . رووناکیو جۆرەکانی تری تیشـك پەسـتانێکیان هەیە کـە دەتوانرێت بپێورێت . هەرچەندە ئەم پەستانە سادەیە بـەلام بە بەردەوام بوونی بۆ مادەیەکی زۆر دەتوانێ پال بـە چەنـد بارستاییەك ئەتۆمەوە بنێ بەرەو یەکتری . هـەر ئەوەندە بارستایی هەورەکە بگاتە رادەیەکی دیاریکراو ئیتر گرانی نامێنێت بەهـۆی ئەو هێزی کێشـەوە ( قوة الجذب ) کە لە بارستاییەکە گەورەکە دروسـت دەبێو چوونـەیـەك لە دەسـت پەستانی تیشـك وەردەگرێت . بەلام هەرچۆنێ بێ پەستانی تیشك تا ماوەیەك وەك هۆکارێکی چوونەیەك بەردەوام دەبێ ، گەرچی گرنگییەکەی بەزیاد بوونی خەستی هـەورە چربووەکە کەم دەبێتەوە .

بیردۆزێکی تازەتر هەیە پشت بە تێك چوونی هێلـە هێزە موگناتیسـییەکانی ( خطوط القوة المغناطيسية ) ناو هەورە تۆزو گازەکە دەبەستێ لـە لێکدانەوەی سەرەتای چوونە یەکدا . تێـك چوونی هێلە هێزەکانیش ، بە پێی ئـەم بیردۆزە ، بە کاری تیشکە گەردوونییەکان ( الاشـعة الكونيـة ) دەبێ .

تیشکە گەردوونییەکان تیشکی کارۆ موگناتیسی نین ، وەك بە ناوەکەیاندا دەردەکەوێ . بەلکـو بە زۆری تەنۆچکە بارگە پۆزەتیڤی وزە زۆرن ، بە خێراییەکی نزیك لە خێرایی رووناکی دەڕۆن . بۆیە لە بارستەو خێراییەکەیانەوە پالهێزێکـی ( قوة دفع ) زۆریان هەیە.ژمارەیەکی زۆر تیشکە گەردوونی. کە لە فەزادا مەلە دەکەن ، دەتوانن هێلە هێزە موگناتیسییەکانی مادەی نێوان ئەستێرەکان بچەمێننـەوە ، بە جۆرێك ئەم هێلانە شێوەی چۆمی قوولی نێوان لێواری چیای بەرز وەربگرن . بەم جۆرە لە چۆمەکاندا دەتوانرێت تەنۆچکە ئەتۆمیی بە سەرەتاییـەکان کـە بە درێژایی هێلەکان دەگەڕێن ، کۆبکرێنەوە .

ئەگەر ئەمە رووی‌دا ئەوا کاتێ دێت کـە وا تەنۆچکەی زۆر بە جۆرێکی وا لە چۆمەکانـدا کۆ دەکرێنەوە ، بتوانن چوونەیەك دەست پێبکەن ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی ئەسـتێرەیەکی سـەرەتایی .

هەردوو ئەم تیۆرییانە پشت بە زروفێـك دەبەستن ــ واتە تیشکە گەردوونی یا پەستانی تیشك ــ کە رەنگە لە گەردوونی سەرەتاییدا نەبووبێ . بۆیە زۆر لەوەناچێ کە ئەو دوو کردارە کاریان کردبێتـە سەر دروست بوونی یەکەم ئەستێرەکان ، گـەرچی کەس ناتوانێ زانیاریەکی وورد لە بارەی زروفـە باوەکانی سـەردەمی دروسـت بوونـی ئەسـتێرە سەرەتاییەکانەوە بە دەست بهێنێت .

زۆربەی ئەوگازەی ئەستێرەی لێ دروست دەبێ بریتییە لە هایدرۆجینی تێکەل بە کەمێـك هیلیۆمو خلتەی کەمی چەند توخمێکی قورستر . ئەمەش بە نیسبەت ئەستێرە تازەکانەوە راستە . بەلام ئەستێرە بە تەمەنەکان ، وادیارە ، وەك لەوەوپێش باسمان کرد، بە برێکی زۆر کەمەوە لە توخمە قورسەکان دروست بووبن ، ئەگەر ئەم توخمانە هەر هەبووبێتن !

تۆزی ناو گازەکە وەك تۆزی لای خۆمان نیـە . هێشتا پێکهاتنی ئەم تۆزە بە وردی نەزانراوە . بەلام هەندێ بەلگە هەیە دەری دەخـات لە تەنوچکـەی کاربۆن پیکهاتووە کە رەنگە لە شـێوەی کۆبوونەوەی وردی گرافیـت دابێ . یا دەشێ مۆلیکیولی زۆر سادەبێ . هەروەها ئەوبڕوایەش هەیە کە لە بەفری ئاوو ئامۆنیاو میسان پێکهاتووە . دیسان دەشـێ ئۆکسیدی ئاسنو دووەم ئۆکسیدی‌سلیکۆنی تێدابێ .

**یەکەم پێویستی بۆ دەست پێ‌کردنی دروست بوونی ئەستێرەیەك بریتی‌یە لە بارستەیەکی سارد لە مادەی نێوان ئەستێرەکان . ئەگونجێ پلەی گەرمای لە ( ١٠٠ )(٤) پلە تێ‌نەپەڕێ‌و لە وانەشە تا رادەی (٥٠) پلە نزم بێت . هەروەها پێویستە ئەم مادەیـە لە گازو هەوای ئاسایی خەستتر بێ ، ئیتر روودانی ئەمە هەرچۆنێ بێت !**

**سیفەتو قـەبارەی ئەســـتێرەی پێکهاتوو ، بارستەی گازە چووەوەیەکە کە دیاری‌ی دەکات . لە ژمێرکاری سەرەتایی‌یـەوە دەرکـــەوتوە کـــە بۆئەوەی ئـەســـتێرەیـەکی سەرەتایی بــە ئەستێرەیەکی هاو بارستەی خۆر بگۆڕێت ئەبێ لە چوونەیەکی هەورێکەوە دروست ببێ تیرەکـــەی ( ٥٠٠٠ ) یەکەی گەردوونی بێ ( وحدة كونية ) ، یەکەی گەردوونیش بریتی‌یە لە دووری نێوان زەوی‌و خۆر ، واتە نزیکەی ٩٣ ملیون میل .**

**یاسای چەسپاوو خێرا نیە ، دەری‌بخات کـەی بارستەیەکی دیاریکراو گاز ئەبێتە هەورێکی چووەیەکو لە کۆتایی‌دا ئەبێتە ئەستێرەیەکی سەرەتایی . لـە وانەیە لە رووی کرداری‌یەوە دڵنیابوون گونجاو بێت لە رووداني چوونــە یەك کاتێ خــەستی مادە نـا ئەستێرەیی‌یەکە دەگاتە رادەیەك لە گەلیـــدا هێزی کێش کردن بتوانێ بارســــتەکە بپارێزێـت لە بڵاو بوونەوە . ئەشێ لە ماوەی چوونەیەکەکەدا کاتێ وا هەبووبێ ، بەهۆی رووداني تێك چوونـەوە لە ناو هەورەکەدا هەورەکە بوو بێت بە پارچەی بچووکترەوە پێش ئەوەی بگاتە قۆناغێکی جێگیر تێك شکاندنی واش ئەشێ ببێتە هۆی دروست بوونی ژمارەیەك ئەستێرە لەجیاتی یەك ئەستێرە .**

دوای ئەوەی نرخی کێش کردن ئەگاتە رادەی پێویست ، بارستە چووەیەکە دەست دەکات بەگەرم بوون ، و گازەکانی‌دەوروو بەری ئەچنە ئەســـتێرە سەرەتایی‌یەکەوەو بارستەکەی زیاد دەکـەن . زیاد بوونی پلەی گەرماش لە گۆڕانی وزەی جووڵانـــەوەوە دەبێت بۆ وزەی گەرمایی . تا ئەم قۆناغەش پلـــەی گەرمای ئەستێرەکە ئەوەندە بەرز نەبۆتەوە بتوانێ لە ناوچـــەی رووناکی بینـــراودا ( منطقة الضـــوء المرئـــي ) تیشـــك بدات بەڵکـــو ئەگونجـــێ تیشك دان لە ناوچەی خوار سووردا ( تحت الحمراء ) بێت . لە وانەیە هەندێ ئەستێرەی خوار ســـوور ، ئەستێرەی ســـەرەتایی بن کە ئەوەندە گـــەرم نـین بدەرو شێنەوە .

قۆناغی یەکـەمی ئەســـتێرە بەردەوام دەبێ تا ماوەیەکی کــەم بگرێتــەوە لە رێگەی پەرەســـەندنی ئەستێرەدا . تا بارستەکە زیاتر بێت کاتی پێویست بۆ تەواوکردنی قۆناغی ئەستێرەی سەرەتایی کەمتر دەبێ چونکە ئەستێرەی قورس بەهۆی توندی کایەی بەهێزی کێش کردنیەوە ( شدة مجال جذبه الكبير ) دەتوانێ لە کاتێکی کەمدا لە دایك بوونی بهێنێتە دی . ئەستێرەیەکی هاو بارستەی خۆر پەنجا ملیون ساڵی پێویستە لە دەســـت‌پێ‌کردنی چوونەیەکەوە هــــەتا سەرەتای داگیرسانی کردارە ناوکی‌یە گەرمایی یەکان ( العمليات النووية الحرارية ) لە کرۆکیدا . لە کاتێکدا ئەستێرەیەکی دەجار لەو قورستر هەمان قۆناغ لـە نیوەی ئەو کاتـــەدا دەبڕێ . بەڵام ئەستێرەیەکـــی پێنج‌یەکی بارستەی خۆر ( ٥٠٠ ) ملیون ساڵی کاتی پێویستە .

ئەوی باسمان کرد دەردەکەوێ کە پەرەسەندنی سەرەتایی ئەستێرە کردارێکی ئەوپەڕی ئاســــانە . کەچی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم دواییەدا کران روونیان کردەوە کە مەسەلەکە ئەوەندە ئاسان نیەو جـــۆری ئەستێرەی پێکهاتوو پشت بە چەند هۆکارێك دەبەستێ وەك خەستی‌و پلەی گەرماو پەشێوی ( اضطراب ) و پێکهاتنی کیمیایی‌و توندی کایەی موگناتیسی .

گەردوونەوانەکان بە هۆی تەلســـکۆبەکانیانەوە چەند تەنێکیان ( اجسام ) دۆزیەوە ، لەو باوەڕەدا بوون ئەستێرەن لە قۆناخی دروست بووندا . ئەمانە لـە شێوەی کۆبوونەوەی خەستی تۆزو گازدا بوون کـە بە هەوری مادەی نێوان ئەستێرەکان دەورە درابوون. ئـــەم تەنانـــە بە ناوی دوو دۆزەرەوەکانیـــانەوە ناونران ( هربج ــ هارۆ ) .

تەنێك هەیە زیاتر سەرنج رادەکێشـێ ئەویش ئەستێرەی « R »ی کەوکەبەی کەرکەدەن ( كوكبة وحيد القرن ) کە بریتی‌یە لە ئەستێرەیەکی زۆر گزو نزیکەی ( ٢٠٠٠ ) ساڵی رووناکی لێمانەوە دوورەو بە تەلسکۆبی بەهێز نەبێ نابینرێ . ماوەیـــەك بڕوا وابوو کە ئەم ئەستێرەیە گرگنێکـە ( قزم ) بـــەڵام دەرکەوت کە شەبەنگەکەی لەگەڵ گرگنەکانـــدا رێ ناکەوێ . لێکۆڵینەوەی نوێ دەری خست کە ئـــەم ئەستێرەیە وزەیەکی زیاتر لە هی خۆر دەدات بەڵام

زۆربەی ئەم وزەیە لە ناوچەی خوار سووردایە . بڕێ ئەو ڕووناکی‌یە بینراوەی ئـەم ئـەستێرەیـە دەیدات زۆر کەمە بۆیە نایبینین .

**بەڵام ئێستا باوەڕ وایە ئەم تەنە بریتی‌یە لـــە ئەستێرەیەکی سەرەتایی دەورە دراوبـە بڕێکی زۆر خەست لە گازو تۆز . لەم زروفانەوە دەردەکەوێ کە ئەم ئەستێرەی « R » هەر بریتی نیە لە ئەستێرەیەك لە قۆناخی دروست بوونیدا ، بەڵکوو کۆمـــەڵەیەکی خۆری‌یە ( مجموعة شمسية ) لە ڕێگەیدا بەرەوهاتنە ژیان .**

**باوەڕ وایە کە زروفێکی وا لەم کۆمەڵـــــەی خۆرەشدا هەبوو کە ئێمەی تیا دەژین . هەروەهـــا باوەڕ وایە کە خۆر بە هەورێکی لـەو شێوەیە لـــە گازو تۆز داپۆشرابوو کە دوا جار لە تۆپەڵە مادەدا کۆ بۆتەوەو خولگەیان ( مدار ) بە دەوری خۆردا گرتووەو پلانێتەکانیان ( کواکب ) پێکهیناوە .**

**کاتێ چوونە یەکی ئەستێرەی سەرەتایی دەگاتە ڕادەیەك پلەی گەرمای ناوەوە بگاتە نیو ملیۆن یان ئەو نزیکە ، ئەگونجێ کارلێکی دیۆتیریۆم دەست پێبکات (تفاعلات ديوتيريوم) ئەبێ ئەوەشمان لە بیر بێ کــە دیۆتیریۆم یەکێکە لە ئایزۆ تۆپەکانی هایدرۆجین‌و وەك هایدرۆجینی ئاسایی لە یەك پرۆتۆن پێك نەهاتــووە بەڵکوو لە پرۆتۆنێك‌و نیوترۆ نێك.جا ئەگەر ئەوگازەی ئەستێرەکەی دروست کردووە بڕێکی باش دیۆتیریۆمی تیادا بێت ئـەوا ئـەتۆمـەکانی دیۆتیریۆم ئەتوانـن تەنۆچکەی ئەتۆمی تر پەیدا بکەن‌و ناوکی هیلیۆم ــ ۳، کە ئایزۆتۆپێکی هیلیۆم ، پێك بهێنن . لەم کارلێکەوە هەندێك وزە دەردەپەڕێ کە دەبێتە هۆی زیادکردنی پلەی گەرمای ناوەوە .**

**کارلێکردنی دیۆتیریۆم ڕوودەدات یاننا ، پلـەی گەرما بەردەوام دەبێ لـــە بەرز بوونەوەدا بـــەڵام تارادەیەك هێواش. کاتێك گەرما دەگاتە دە ملیۆن پلە یان زیاتر کارلێکردنی پرۆتۆن ــ پرۆتۆن(٥) دەســت پێدەکات ، هەروەك ئەوەی ناو خۆری خۆمان . بـە ڕوودانی ئەمە ئەستێرە سەرە تایی‌یەکە ئەبێت بـە ئەستێرەیەکی پێگەیشتوو . ئەگەر بارستایی ئەستێرە سەرەتایی‌یەکە زیاتر بێت ئەوا پلەی گەرما ئەشـــێ بگاتە ۲٥ ملیۆن‌و بەمەش کارلێکردنی سووڕی کاربۆن ( دورة كربون ) دەست پێدەکات . لە هەر یەکە لەم دوو کارلیکەدا ، واتە پرۆتون ــ پرۆتۆن‌و ســـووڕی کاربۆن ، ئەستێرەکە دەستی کردووە بە ناوکە کارلێکی گەرمایی ( التفاعلات النووية الحرارية ) ، ئەو کردارەی هەموو ئەستێرەکان دەبات بەڕێوە .**

کاتێ ناوکە کارلێکەکان دەست پێدەکەن ، پلـە گەرما بەرزە پێکهاتووەکەی ناو ئەستێرەکە پەستانێکی بەرز دروست دەکات کە دواجار لەگەڵ هێزی کێش کردندا هاوتا دەبێ‌و چوونەیەك دەوەســتێ . دوای ئەمە ئەستێرەکە جێگیر دەبێ‌و شوێنی گونجاوی خۆی لە نێوان ئەستێرەکانی کۆمەڵی ( بە دوای یەکا هاتنی سەرەکی ــ التتابع الرئيسي )(٦) دا داگیر دەکات .

بارستایی ئەستێرەکە کاتێ دواجار دەگاتـــــە ( بەدوای یەکا هاتنی سەرەکی ) لە سەری بارستەی مادە نێوان ئەستێرەیەکەی کاتی سەرەتای چوونەیەك وەستاوە . لەبەر ئەوەی هەوری نێوان ئەستێرەیی قەبارە جیاواز هەیە ، بۆیە ئەستێرەی بارستە جیاواز دروست دەبن‌و بەدرێژی ڕیزی ( بە دوای یەکا هاتنی سەرەکی ) ڕێ دەکەون .

درێژایی ئەو ماوەیەش کە ئەستێرەیەك تیایدا لە ناو ئەم کۆمەڵەدا دەمێنتەوە هەر پشت بە بارستەو پلەی گەرما دەبەستێ . ئەستێرەی بارستە گەورەو گەرم ، سووتەمەنی‌یەکەی بە خێرایی‌یەکی زۆرتر کار دەبێ ، بە جۆرێ بۆ ماوەی تەنیا چەند ملیۆن ساڵێك لەسەر ( بە دوای‌یـەکا هاتن ) دەمێنێتەوە . بـەڵام ئەگەر ئەستێرەکـە بچووك‌و ســـاردتر بوو ئـــەوا سووتەمەنی‌یەکەی لە سەرخۆ کار دەکات‌و دە هەزار ملیۆن ساڵ یان زیاتر لە ســەر بـە دوای یەکا هاتنی سەرەکی دەمێنیتەوە .

**ئەســــتێرەکان بە جێگیری لـــەم کۆمەڵـەدا ئەمێننەوە تا کارکردنی بەشـێکی دیاری‌کراو لـــە بارســتەکەیان بە ســـووتاندنی ناوکـی ( الاحتراق النووي ) . جا ئەگەر ئەستێرەکە گەیشتە ئەو ڕادەیە ئەوا لەو کۆمەڵەیە دەردەچێ‌و دەبێتە جۆرێکی تر کە پێی دەوترێت زەبەلاحی ســـوور(٧) ( العملاق الاحمـــر ) .**

**ئەستێرەکە لە سەدا دەی هایدرۆجینەکەی ناوی کار دەکات دەگاتە ڕادەیەکی ناجێگیر . لەم پلەیەدا کرۆك دەچێتـــــە یەك‌و وزەیەك دەردەچێ پاڵ بـــە ناوچەکانی دەرەوە دەنێ‌و ناچاری کشـــانیان دەکات . بە دەرچوونی وزەی چوونەیەك ( طاقـــة الانكماش ) ئەستێرەکە گەرمتر دەبێ ، بەڵام ناوچەکانی دەرەوەی**

سارد دەبنەوە . ئەمەش بەوە لێك دەدرێتەوە کە ئەم ناوچانە زۆر کشاون . هەروەها بە بوونی ئەم ناوچە دەرکیانەش کە گەرمایەکی زیاتر دەدەنەوەو دیسان لەبەر ئەوەی خێرایی کشانی ئەم ناوچانە زیاترە لە رادەی زیاد بوونی پلەی گەرمای ناوەوە ، ئەمانە ئەبنە هۆی کەم بوونەوەی پلەی گەرمای رووی ئەستێرەکە.

بەم پێیە ئەستێرەکە قەبارەی گەورەتر دەبێ‌و لە دەرەوەش سارد دەبێتەوە بۆیە رەنگەکەی بەرەو سوور هەڵ گەڕان دەڕوات . لەم کاتەدا ئەستێرەکە چۆتە کۆمەڵی زەبەلاحە سوورەکانەوە ( العمالقة الحمر ) یان تەنانەت کۆمەڵی سەروو زەبەلاح ( فوق العمالقة ) . وەك زەبەلاح یان سەروو زەبەلاحێك گەشبێتی ( لمعان ) ئەستێرەکە زیاد دەکات ، گەرچی ساردتریش بۆتەوە . ئەمەش ئاشکرایە چونکە رووەکەی زیاد بووەو رووناکی یەکی زیاتر دەداتەوە .

بە هۆی کشانی کرۆکی ئەستێرەکەوە خاسیەتەکانی مادەکەی ناوی دەگۆڕێ‌و دەبێ بەوەی ( مادەی نائاسایی ! المادة الحیویة ) ی پێ دەوترێت. لەم بارەدا هەموو پێکهاتنە ئەتۆمی یەکان وون دەبن‌و مادەی کرۆك ئەبێ بە تۆپەڵێك مادەی ئەتۆمی سەرەتایی داگیراو ( واتە تێکەڵێك لە تەنۆچکە ئەتۆمی یەکان ، ئەلکترۆن ، پرۆتۆن ، نیوترۆن ، بێ‌ئەوەی ئەتۆم پێك بهێنن . وەرگێر ) .

پاش ئەوەی کرۆکی ئەستێرەکە دەگات بە دۆخی نائاسایی ( لادانەکی ! ) سووتانی هایدرۆجین لە چینی نێوان کرۆك‌و پاشماوەی ئەستێرەکە بەردەوام دەبێ – واتە ئەوچینەی یەکسەر دوای کرۆك دێت بۆ دەرەوە .

ئەم ناوچەیەش کەوا سووتانی تیا روو دەدات نائاسایی نیە . ئێستا ئێمە لە بارێکداین وزە تیایدا بە هۆی ناوکە کارلێکی گەرمایی ئاسایی یەوە دروست دەبێت بێجگە لە وزەی دەربەڕیو بە هۆی چوونەیەکی کرۆکەوە . چینە تیشك دەرەکەی ئەستێرەکەش ناتوانێ ئەم هەموو وزە زۆرە بەرێ بکات بۆیە لە ئەنجامدا پلەی گەرمای ناوەوە بە خێرایی بەرز دەبێتەوە .

کاتێ پلەی گەرمای ناوەوەی ئەستێرەکە ئەگاتە نزیکەی هەشتا ملیۆن پلە ، هیلیۆم ، واتە بەرهەمی سووتانی هایدرۆجین ، دەست دەکات بە ناوکە کارلێکی گەرمایی‌و ئەگۆڕێ بە توخمی قورستر . سووتانی هیلیۆمیش پلەی گەرما بەرز دەکاتەوە .

سووتانی هیلیۆم بە فلاشی هیلیۆم ناو دەبرێت. وشەی فلاشیش بۆیە بەکار دەهێنرێ چونکە ئەم کردارە بە نیسبەت تەمەنی ئەستێرەکەوە چەند لەحزەیەك دەخایەنێ . بێگومان ئەم سووتانە نزیکەی هەزار ساڵ بەردەوام دەبێ بەڵام ئەم کاتە بە چرکەیەك لە چرکەکانی سەعاتی تەمەنی ئەستێرە دادەنرێت .

کەم لە وزە زیادەکەی بەرهەمی فلاشی هیلیۆم بۆ ناوچەکانی دەرەوەی ئەستێرەکە دەگوێزرێتەوە . چینی چڕی هایدرۆجینی بەشەکانی دەرەوە ناتوانێ ئەم وزە زۆرە بۆ دەرەوە بگوێزێتەوە . بۆیە پلەی گەرمای ناوەوەی ئەستێرەکە بەردەوام لە زیاد بووندا دەبێ .

تەواو ئاشکرایە کە ئەم بارە نابێ بەردەوام بێ‌و بەراستیش بەردەوام نابێ . پاش ئەوەی پلەی گەرما ئەگاتە رادەیەکی باوەڕ پێ‌نەکراو ، نزیکەی ( ٣٥٠ ) ملیۆن پلە ، پێویستە شتێك روو بدات . بارستە نائاسایی یەکەی کرۆکی ئەستێرەکە ناچار دەبێ بکشێ‌و لە مەشەوە نائاسایەتی کەم دەبێتەوەو تەنۆچکە ئەتۆمی یەکان بۆ دۆخێکی نزیك لە ئاسایی ئەگەڕێنەوە کە ئەمە روودەدات ئەستێرەکە بە خێرایی دەکشێ‌و بەمەش سارد دەبێتەوە .

پێش روودانی فلاشی هیلیۆم ئەستێرەکە گەیشتبووە قۆناغی زەبەلاحە سوورەکان . بە هۆی ناجێگیری پێکهاتنی ناوەکەیەوە ، ئەستێرەکە هەندێ جار دەبێتە ترپەکەرو ( نابض ) بەمەش قەبارەو گەشی یەکەی زیاد دەکەن ، پاشان ئەچێتە یەك‌و گر دەبێتەوە . ئەستێرەیەك دەگونجێ زیاد لە جارێك بە قۆناغی فلاشی هیلیۆمدا بڕوات ، گەرچی بە دوای یەکا هاتنی سووتانی هیلیۆم تەمەنی درێژ ناکات بەڵکوو ئەستێرەکە گەیشتۆتە سەرەوخوارکەی بەرەو نەمان .

هەموو ئەستێرەیەك بەشێك لە بارستایی یەکەی دەدات بە فەزای دەوری ، لە شێوەی باو گەردەلوولی پرۆتۆنیدا کە لێوەی دەردەچن . ئەستێرە گەورەترو پلەی گەرما بەرزەکان بارستایەکی زیاتر ووندەکەن لەوەی خۆر وونی دەکات . پاش ئەوەی ئەستێرە دەگاتە قۆناخی زەبەلاحی سوور بارستایی یەکی زیاتر لەوەو پێش وون دەکات . هۆی ئەمەش زیاد بوونی رووبەری ئەو رووبەکە کە ووزە وون دەکات . ئەگەر پلەی گەرمای کرۆك تا رادەیەکی دیاریکراو بەرز بێتەوە

ئەستێرەکە لە ڕێگەی ئەو تەقینەوە بچووکانەوە کە تیایدا ڕوو دەدەن دەتوانێ بارستایی‌یەکی زیاتر وون بکات بەمە ئەستێرەکە دەبێت بە ( نۆڤا ) . یان لەوانایە بڕێکی ئیجگار زۆر لە بارستایی‌یەکەی بە هۆی یەك تەقینەوەی گەورەوە وون بکات ، لەم بارەشدا ئەستێرەکە پێی دەووترێت ( سۆپەر نۆڤا ). تا ئیستاش ئەو هۆیە بەتەواوی نەزانراوە کە بۆچی ئەستێرەیەك دەبێت بە نۆڤا ، یا سوپەر نۆڤاو نابێت بە شتێکی تر .

لە هەموو بارەکاندا ئەستێرەکە دەچێتە یەك‌و پاش گەیشتنی بە قۆناغی زەبەلاحە سوورەکان گەرم دەبێ‌و ئەشێ ببێت بە گرگنێکی سپی ( قزم أبيض ) . باوەڕیش وایە زۆربەی ئەو ئەستێرانەی دەبن بە گرگنی سپی لەناودەچن ( واتە ئەو ئەستێرە بارستە بچووك‌و زۆر گەرمانەی بە زۆری لە مادەی نا ئاسایی پێکهاتوون ) . پاش بلیۆنان ( هەزاران ملیۆن ) ساڵ گرگنە سپی سارد دەبێتەوەو دەبێتە گرگنێکی ڕەش کە ئەمەش کۆتایی پەرەسەندنی ئەستێرەیە .

بەمە سوورێکی تەواومان لە هەوری گازو تۆز بڕی ، کە ئەستێرەی یەکەمی لێ دروست دەبێ ، بۆ پشکۆیەك کە ئاگری گرتووەو لە فەزا دایەو ناتوانرێ بدۆزرێتەوە . ئەمە وێنەیەکی کلاسیکی پەرەسەندنی ئەستێرەکانە پاش دۆزینەوەی نهێنی‌یەکانی .

چەند مەسەلەیەکی پەیوەندی دار بەم پەرەسەندنەوە هەیە کە هێشتا زانراونیە ــ واتە ئەو بۆشایی‌یانەی لە زانیاریدا هەن‌و دەتمێ کاتی خۆی لە ڕێگەی ڕوانگەوە پڕ بکرێنەوە . بێجگە لەوەش پێویستە زیاتر بزانین لە بەرەی هەندێ قۆناغی پەرەسەندنەوە ، بە تایبەتی ڕێڕەوی زەبەلاحە سوورەکان هەتا لە ناو چوون .

خۆریش وەك ئەستێرەیەك بەرێگەی پەرەسەندندا دەڕوات . ئەشێ پێش زیاد لە پینج هەزار ملیۆن ساڵەوە دەستی کردبێ بە چالاکی‌و پینج هەزار ملیۆن ساڵی وەك ئەستێرەیەکی بەدوای یەکا هاتنی سەرەکی بەسەر بردبێ ( کە ئیستەش هەر لەو قۆناغەدایە )و دوای پێنج هەزار ملیۆن ساڵی‌تر ببێت بە زەبەلاحێکی سوور .

کاتێ کە ئەمە ڕوو دەدات زەوی لە ناوەدانی دەکەوێ‌و ئەمەش کۆتایی مرۆڤایەتی دەبێ . مەگەر تا ئەوکاتە بتوانین بڕۆینە سەر ئەستێرەیەکی ترو لەوێ بەدوای پلانێتێکی تردا بگەڕێین تا بیکەین بە نیشتمان.

پەراوێزەکان ــ وەرگێر ــ

(١) گالاکسی : بە کۆمەڵێکی زۆر ئەستێرە دەوترێت کە لە ژێر رژێمێکی تایبەتیدا پێکەوە کۆبوونەوە . وەك گالاکسی ڕێگەی کاکێشان کە ( ١٥٠ ) هەزار ملیۆن ئەستێرەی تێدایە ، کە خۆری خۆمان یەکێکیانە !

(٢) بە پێی ئەم تیورە سەرەتای گەردوون بە تەقینەوەیەکی مەزن دەستی پێ کردووە کە لە هەورێکی خەستدا ڕووی داوە . ئەو پارچانەی لە ئەنجامی تەقینەوەکەدا جیا بوونەتەوە ئەستێرەو گالاکسی‌یەکانیان دروست کردووە.

(٣) بۆشایی نێوان ئەستێرەکان خاڵی نیە بەڵکوو مادەیەکی ئیجگار پەرشەوە بووی تیادا بلاوبۆتەوە کە لە گازو شتی‌تر پێکهاتووە ، ئەم مادەیە کە بە مادەی نێوان ئەستێرەکان دادەنرێت ، بەسەر چاوەی دروست بوونی ئەستێرەی تازە دانراوە .

(٤) پلەی گەرمابە پێوانەی گلڤن پێوراوەکە دەکاتە ( پلەی سەدی ٢٧٣ ) .

(٥) کارلێکردنی پرۆتۆن ــ پرۆتۆن : دوو پرۆتۆن یەك دەگرن ، لە ئەنجامدا ناوکێکی دوو پرۆتۆنی‌و وزە پەیدا دەبێ . بەو جۆرە ناوکی هیلیۆم دروست دەبێ .

سووری کاربۆن : سوڕێك کارلێکردنی ناوکی‌ی ئاڵۆزە کاربۆن بەشداری دەکات .

(٦) بە کۆمەڵێکی زۆر لە ئەستێرەکان لە جۆری خۆر دەووترێت . ناوەکە شیان لەوەوە هاتووە کە هەموو ڕەنگەکانی شەبەنگیان هەیە ، هەر لە شینەوە تا سوور .

(٧) زەبەلاحە سوورەکان بە ناوەکەیاندا دیارە کە قەبارەیان گەورەیەو ڕەنگیان ، بە هۆی نزمی گەرمای ڕووەکەیانەوە ، سوورە . ئەمانە ئیجگار گەشن‌و قۆناغی دوای ( بە دوای یەکا هاتنی سەرەکین ) .

# لاپەڕەیەك لە مێژووی كۆنی كوردستان

زبیر بلال اسماعیل

مەننائیەكان یەكێك بوون لەو كۆمەڵەو نەتەوانەی كە لە كۆنەوە لەگەڵ چەند نەتەوەیەكی تردا لە چیاكانی زاگروس(١) نیشتەجێ بووبوون ، ئەوەندە هەیە تا ئێستە نەزانراوە ئایا ئەم نەتەوەیە لە كەیەوە لەو هەرێمەدا جێگیربوون .. بەڵام وەك دەردەكەوێت وڵاتەكەیان یەكێك بووە لەو دەڵەوتەئێرانیە كۆنانەی كە بە ( pre – Iranianstate ) ناسراون . كە توانیویانە زۆر بە ناوچەكانی دەوروبەری ئۆرمیا بكرنەدەست .. دووای ئەوەی مەننائیەكان بێهێز بوونو كە توانای ئەوەیان نەما خۆیان راگرن ، ئەو دەوڵەتانەی كە دراوسێی بوون چاویان بڕیە وڵاتەكەیانو دەستی تەماعیان بۆ درێژكردو زۆر ناوچەیان لێ داگیر كرد ، لەبەر ئەمە رۆژ دووای رۆژ بەرەو كەمبوون هەڵئەكشا ، تا لە سەردەمی ( سەرجۆنی ئاشوری ٧٢١ – ٧٠٥ پ . ز ) دا ، بە تەواوی سەرنوگوم كرا . لە دووەم پەلامارە بەناوبانگەكەی ( سەرجۆنی دووەم ) دا كە لە ساڵی ( ٧١٤ پ . ز ) بوو ، باسی مەننائیەكان ئاشكراو روونكراوەتەوە كە پادشاكەیان لەگەڵ ئاشوریەكاندا هاوپەیمان بووە ، وە لەكاتی دەست درێژیكردنی دەوڵەتە دراوسێكانیا بۆ سەر وڵاتەكەی پەنای بردۆتە بەر ( سەرجۆن ) بۆ ئەوەی لە دەستیان بیپارێزێت . ئەو ناوچەیە كە لە ژێر حكمڕەوای مەننائیەكان دا بوو گەلێ بە پیتو بەرەكەت بوو ، مەڕومالاتێكی زۆری هەبوو ، هەروەها گەلێ كانی مەعدەنی تیا هەبووە ، لە بارەی ئازوقەو خواردەمەنیو سازدانی تفاقی لە شكرو هەموو پێویستیەكی ژیانەوە بە ناوبانگبووە ، بۆیە هەر پاشایەكی ئاشوری كە بێیكرابێ بەسەر شاخەكانی زاگروسدا دەربازو ئاوابێ لەو سەرەوە كە گەڕاوەتەوە پڕ بە بارو بارخەنەو دەسكەوتو تاڵانەوە هاتۆتەوە . بەڵام پەلاماردانو هێرش بردن بۆ سەر ئەو وڵاتە بە سووكو ئاسانی تەواو نەبووە ، وە بۆ كەم دەوڵەت لواوە ، چونكە لە كاتی بەرەنگاری كردنی داگیركەراندا ، وە نەبێ تەنها نیشتەجێكانی ئەو ناوچانە كە لە دەوروبەری دەریاچەی ( ئورمیا )دا دەست بەخەی داگیركەران راوەستابن بەڵكو ئەو نەتەوانەش كە هەمیشە چاویان بڕیبووە خەیراتەكەی لە هەمان كاتدا بەرەنگاری داگیركەران ئەبوون ، واتە ئەو نەتەوانەی كە هاوسێی بوون وە كە لە رۆژهەڵاتو سەرووی رۆژئاوایەوە بوون دووبارە بەرەنگاری داگیركەرانیان دەكرد . ئەم بەرنگاریەشیان لەبەر خاتری چاوی كاڵی ( مەننایئەكان ) نەبوو بەڵكو لەبەر ئەوەبوو كە حەزیان لەوە نەبوو ئاشوریەكان ببن بە هاوسەریان لە زەوت كردنی خەیرو بێری وڵاتی مەننایئەكاندا ، ئەو نەتەوانەی كە لەگەڵ (ئاشوریەكان) دا مل ملانێیان دەكرد ، **یەكەم : وڵاتی (ئارارتۆ)(٢) بوو كە خەڵكەكەی بە ئازاد شەركەر ناویان دەركردبوو ، دووەم : چەند نەتەوەیەكی تازە پێگەیشتوو بوون كە لە سەردەمی (سەرجۆن) دا بە (زگرتو – زەگورتیەكان) دەناسراون كە ئەمانەش وەچێك بوون(٣) لە خێڵەكانی ئێران .. و كە لەسەردەمی ( شلما نصری سێیەم )دا** لە رێگە سەختەكەی ( راجا ، ( Raga ) و دەرگای ( قەزوێن ) ەوە بەرەو ( تەبرێز )(٤) ملیان نابوو بەرەو دەوروبەری دەریاچەی ورمێ ( ئورمیا ) ، بەڵام ( ئارارێتەكان – الاراریتون ) بەرپەنگی لێشاوی ئەو كۆچكردنەیان دایەوەوە لە شوێن خۆیاندا رایان گرت(٥) .

ئاشوریەكان گەلێ جار پەلاماری ئەو وڵاتانەیان داوە كە ئەكەونە پشت شاخەكانی زاگرۆسەوە ، وە خۆ هەڵكێشانێكی زۆریان دەكرد بەوەی كە گوایا لەكاتی گەڕانەوە یاندا تاڵانیو دەستكەوتێكی زۆریان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا . بەڵام ئەوەندە هەبوو ئەبێ ئەوەش بزانرێ كە لەمە پشیان لەو وڵاتانە هەڵ نەچەرخانو پێش ئەوەی بگەنەوە وڵاتەكەی خۆیان دەستەڵاتیان بەسەر ئەو شوێنانەدا نەدەما(٦) . كە ( سەرجۆی ئاشوری ) لە ساڵی ( ٧٢٢ پ . ز ) دا چووە سەرتەخت لەو سەردەمەدا ئەم حاكمانەی خوارەوە لە شاخەكانی زاگرۆسدا حكمیان دەكرد :

١ – ئۆرسا (اورسا) كە خاوەنی وڵاتی (ئارارتۆ) بو .

٢ – مەتاتی (متاتی) كە خاوەنی وڵاتی (زگرتۆ) بو .

٣ – ئەیانزو (ایانزو) كە نازناوە واتە پاشا ، ئەمەش خاوەنی وڵاتی مەننایئەكان بو .

وە لە لەراستیا ئەم ( ئەیانزۆ ) یە هاوپەیمانی ئاشوریەكان بوو .

دووای ئەوەی ( ئورسا ) و ( متاتی ) پەیمانێكی دوو قۆلیان لە دژ ( مەننایئەكان ) بەست ، بە هەردووكیانەوە پەلاماریان بردە سەر وڵاتەكەیانو شوێنێكی زۆریان لێ داگیركرد . ( ئەیانزو ) كە بۆی دەركەوت بەرگری پێناكرێت پەنای بردە لای

( سرجۆن ) . وە لە سالی ( ٧١٨ پ . ز ) دا سەرجۆن بەدەم هاواری مەننایئەکانەوەچوو ، وە یارمەتێکی زۆری‌دان ، ئەو شوێنانەی کە لێیان داگیر کرابوو هەمووی خستەوە ژێر دەسیتان . بەلام ( ئەیانزو ) پێش ئەم بەدەم هاتنەوەی سەرجۆنە مرد . لەبەر ئەوە ( سرجون ) لە سالی ( ٧١٧ پ . ز ) دا پادشایەی تری لە شوێنی دانا کە ناوی ( ئازا Aza ) بوو ، بەلام ( ئازا ) دووای دوو سال لە پەلامارێکدا کە بردی بۆ سەر دوژمنانی بەندکرا . . ئەمەش‌دووایی‌ئەوەبوو کە ( ئورسا ) و ( متاتی ) پەیمانێکیان لەگەل یەکێك لە سەرۆکە ئێرانیەکان‌دا بەست کە ناوی ( بەگدتو Bagdattu ) بوو ، ئەم سێ کەسە ( بگدتو ، ئورسا ، متاتی ) ئازارێکی زۆری ( ئازا ) یان‌دا ، و لەپاش‌دا پشتیان گرتو ، لاشەکەیان لەسەر شاخی ( ساهند ـ یواش )(٧) هەلواسی .

( ئوللو سونو ـ اوللو سونو ullu sunu ) کە برای ( ئازا ) بوو لایەن سەرجۆنەوە کرا بە جێگەداری ئازای برای. فەرمانرەوای وولاتی مەننایی کەوتە ژێردەستیەوە و سەرجۆن توانی کە ( بگدتۆ ) بگرێت وە لەو شوێنەدا کە ئازای برای سەربرابوو ، سەری بگدتۆ ببرێت‌و پێستی لێ‌بکاتەوە .

پاش ئەوی ( سەرجۆن ) لە پەلامارەکەیا بەرەو وولات گەڕایەوە ، ( ئوللوسونو ) لەگەل ( ئورسا ) کە پاشای ( ئارارتو ) بووە ، ( ئاشور لیئو ) کە پاشای ( کرللا ) بووەوە ( ئاتی ـ اتی ) کە پاشای (اللابريا )(٨) . بو پەیمانی بەست لەسەر بناغەی بارمتە دانان ( الرهائن ) کە بریتی بو لەوەی ( ئوللوسونو ) دلسۆز ترین ئەندامی خێزانی خۆی بە بارمتە دانێ تا هاوپەیمانەکانی دلنیابن لەوەی کە سوورە لەسەر جێ‌بەجێ‌کردنی ئەو مەرجانەی کە لەسەری رێك‌کەوتوون بەلام هێشتا سالێك بەسەر پەیمانەکەدا ( ٧١٧ پ . ز ) نەرۆیشتبو ( سەرجۆن ) گەرایەوە بۆ تەمێ‌کردنی هاوپەیمانەکان . لە ئەنجامی گەڕانەوەکەیدا ( ئاشور لیئو ) و ( ئاتی ) ی بەدیل گرتوو هەردووکیانی شاربەدەرکردن ، بەلام لە ( ئوللسونو ) خۆش‌بوو .

لە سالی ( ٧١٥ پ ز ) دا ( دەیۆکۆ ) کە فەرماندەری یەکێك لە ناوچەکانی ( مەننایئەکان)(٩) بۆ لەگەل ( ئورسا ) فەرماندەری ناوچەی ( ئورارتۆ ) پەیمانێکیان بەست ، ( دێۆکۆ ) یەکێك لە کورە جگەرگۆشەکانی بە بارمتەی جێ‌بەجێ کردنی پەیمانەکە لای ( ئورسا ) دانا بۆ ئەوەی ( ئورسا ) دلنیا بکات .

لەبەر ئەنجامی ئەو پەیمانەدا ( ئورسا ) بیست‌و دوو گوند کە دەکەونە ناوچەی ( مراغە ) ی ئێستەوە ـ لە وولاتی ( مەننایئەکان ) داگیر کرد . هەروەها ( دەیۆکۆ ) ش لەبەرەی خۆیەوە هێرشی بردە سەر وولاتەکە . سەرجۆن هەندێ لە هاوینی سالی ( ٧١٥ پ . ز ) بە گەران بە شوێن ( دیۆکۆ ) دا بردە سەرەوە کە دۆزیەوە ، دەست‌بەسەری کردو لە شاری ( حماة ) لە سوریە داینا .

بەلام وەنەبێ بە دەرکردنی ( دەیۆکۆ ) ئاگری پەیمان خۆرەکان کپ کرابێتەوە . بەلکو ( ئورسا ) پاشای ( ئورارتو ) و ( مەتاتی ) پاشای ( زگرتۆ ) پەیمانە کۆنەکەیان دووبارە زیندوو کردەوە . کە ( ئوللسونۆ ) بەمەی زانی بۆ دووەم جار پەنای بردە بەر ( سەرجۆن ) بەلام ئاشوریەکان لە ئەنجامی‌هێرشە بەناوبانگەکەیان کە بە هێرشی هەشتەم دەژمێردرێ بۆ سەر ( میدیا ) و ( خلدیا ـ اورارتو ) بە تەواوی پەکیان کەوتبو . ئەوەی شیاوی باس‌لیۆەکردن بێ‌ئەوەیە کە ( سەرجۆن ) لە کاتی چوونە ناو شاخەکانی زاگروسەوە توانی هەندێ میرنشین کە هەبوون هەموویان لاببات بەلام کە لە قەلای ( شینو خینو ) نزیك بووەوە هەموو خەلکەکە پێشوازیان لێ‌کرد ، یەکێك لەوانە کە پێشوازی لێ‌کرد پایەتەختی مەننایئەکان ( ئیزرتو ـ ایزرتو )(١٠) بو . وە کە پاشاکەی زانی سەرجۆن نزیك بووەتەوە خۆی‌و دەست‌و پەیوەندی‌و هەموو سەرۆك خێلەکانی چوون بۆ پێشوازی‌یەوە . ئاشوریەکان پێش ئەوەی روو بە رووی دوژمنەکانیان راوەستن چەند میرنشینێك هەبوون هەموویان لەناوبردن ، ئەوجا هێرشیان بردە سەر ( ئورسا ) خاوەنی وولاتی ( ئورارتۆ ) کە وولاتەکەی خۆی لەسەر وولاتی ( مانئنایئەکان ) گەورە کردبوو کە ئەوانیش دۆستی ئاشوریەکان بوون . لە کۆتایی ( سەدەی نۆوی پ . ز ) دا ( منواش Menuash ) کە پاشای ( ئۆرارتۆ ) ەکان بوو ، وولاتی مەننایئەکان لە رۆخی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ ( ئۆرمیا ) تا رۆخی خواروی داگیرکردبوو . وەکو شکێکی لەو شوێنەدا کە ئێستەپێی ئەووترێ ( طاش پتە ) دروست کرد . ئەم شوێنە لە وەختی خۆیدا یەکەم شاری گەورەی ( مزتا Mesta ) بووە .

سەرجۆن هەموو دۆستەکانی ( ئورسا ) ی

پەرتو بڵاوکردن ، وە لەپاشدا دەستی کێشا بەسەر هەموو شارەکانو قولەکانی ئەو وڵاتەدا . لە شکری ئاشوریەکان نزیکەی بیست میلیان مابوو بگەنە پایتەختەکەی ( ئورسا ) کە شاری ( تشبا ) بوو وە ئەم شارە لە شوێنی شاری ( وان ) ی ئێستەدا بووە .. ئورسا هەموو لەشکرەکانی خۆی لەم شارەدا کۆکردبووەوە لە داخی ئەو شکاندنەی کە بەسەرخۆیو لەشکری هاوپەیمانەکانی داهات کە ( زگرتیە ) کان بوون ، لە داخا تووشی نەخۆشیکی خراپ بوو . کە ( سەرجۆن ) لێی نزیك بووەوە لە ترسا ڕای کردو دایە شاخ وە لەوێ خۆی کوشت . بەڵام ( سەرجۆن ) نەچووە ناو شاری ( وان ) کە پایتەختی ( ئۆرارتیە ) کان بوو ، کەچی دەستی بەسەر هەموو شارەکانی ( ئۆرارتیەکان ) دا گرت کە هەموویان دەکەوتنە لای سەروی دەریاچەی وانەوە .

**پەراوێزەکان ( الهوامش )**

١ ـ زاگروس : بەو زنجیرە شاخە دەگوترێ کە لە ( ئارارات )ەوە درێژە دەکێشی تا ناوچەی خوزستان ، وە ئەم زنجیرە شاخانە تورکیا لە ئیران جیا دەکەنەوە هەروەها سنووری عیراق لە ئێران جیا دەکەنەوە .

٢ ـ ئۆرارتو ( اورارتو ـ خلدیا ) : ناوی ئورارتو لە ( تەورات )دا هەیە بەناوی ( ئارارات ) . ووشەی ئورارتو ـ بۆ ئەو وڵاتانە بەکار دەهێنرا کە دەکەونە دەوروبەری دەریاچەی ( وان ) .. ئەم ووشەیە پەرەی سەند تا نە ( سەدەی هەشتی پ . ز )دا ئەو ناوچانەی کە لە چوار دەوریدەریاچەی ئورمیا بوون دووبارە بە ئارارات ناودەبران . هەندێ زانایان لایان وایە وڵاتی ئورارتو وڵاتی ئەرمەنیەکونەکان دەگرێتەوە .

٣ ـ بەڵام ووشەی یەکەم دووەم بریتیبوون لە فارسەکانو میدیەکان .

٤ ـ تەبریز : پێش سەدەی نۆهەمی پ . ز شار نەبوو بەڵکو بریتیبوو لە چەند گوندێك .. زۆر نزیکە ئەو گوندانەی ئەوسای پێش ئەو سەدەیە هەموو پەرەیان سەندیێو بووبن بە شاری تەبرێزی ئێستە . ناوە زۆرەکانی شاری تەبرێز شوێنەواری ئەو گوندە زۆرانەیە کە ئێستە شارەکەیان لێپێك هاتووە . تەماشای ( سۆمر ( ١٩٤٩/٥ )دا وێنەکەی لاپەرە ٢٤٠ ـ ٢٤١ بکە .

٥ ـ تەماشای گۆڤاری سۆمر ( ٥ ) بەرگی دووەم ( ١٩٤٩ )ودا وێنەکەی لاپەرە ( ٢٣٠ ) بکە .

٦ ـ هەمان سەرچاوەی پێشو . لاپەرە ٢٢٣ .

٧ ـ ساهند ( یواش ) : یەکێك لەلووتکەکانی پێدەگوترێ شاخی ( یواش ـ دەرگا ) زنجیرەیەك لەو شاخە بەرەو خواروو دەکشێت وەك خەتی دابەشکرنی ئاو وەهایە لە نێوان رووباری کرنجۆ karangu کە بەرەو رۆژهەڵات دەکشێو لە نێوان رووباری ( لێلانچای ) کە بەرەو رۆژهەڵات دەکشێ . بۆ ئەمە تەماشای ( سۆمر (١٩٤٩/٥) وە داوێنەکەی لاپەرە (٢٣٥) بکە .

٨ ـ لەوانەیە کە ( کرالاو اللابریا ) دۆڵی زەردەشتی ۆوروو خوارو بگریتەوە .

٩ ـ دەیۆکو ( دیوکو ) یەکێكبووە لەو حاکمانەی کە یەکێك لە ناوچەکانی ( میدیا )ی حوکم کردووە ، گومانی ئەوەش دەکرێ کە حوکمی شاری ( ئەکبتانا )ی کردێ .

١٠ ـ ئێزرتۆ ( ایزرتو ) : زۆربەی مێژووناسەکان لایانوایە ئیزرتۆ لە شوێنی شاری ( سەقزی saqiz ) ی ئێستەیە . سەرجۆن نەچووەتە ئەم شارە ، کەچی سەرچاوە مێژوییەکان وادەگەیێنین کە چووتە ئەم شارەوە تەماشای کتێبی ( Assyria ) لاپەرەی ٢٣٠ ـ ٢٣١ بکەن . دانەر olmstead .

**سەرچاوەکان :**


١ ـ گۆڤاری سۆمر مجلد (٥) بەرگی دووەم (١٩٤٩).

٢ ـ مێژووی ئاشوریەکان : دانەر ئۆلمستید (١٩١٢).

٣ ـ التاریخ الاثری القدیم یئیران دانەر : هرتسفلد .

٤ ـ کتێبی ( فارس ) دانەر . جاکسون

٥ ـ کتێبی رۆژئاوای ئاسیا لە سەردەمی سەرجۆنی ئاشوریدا . دانەر ئۆلمستید ١٩١٨ .

A. T. olmstead's, western Asia in the Days of sargon of Assyria 1918.

٦ ـ اربیل فی ادوارها التاریخیە زبیر بلال اسماعیل النجف الاشرف ١٩٧١ .

٧ ـ المرشد الی مواطن الاثار . طە باقر . المرحلە الخامسە بغداد ١٩٦٥ .



# تۆمارێکی تایبەتی دەربارەی تیپی نواندنی سلێمانی

* حمه سعید حمه کریم *

بەبۆنــەی یــادی ( ١٠ ) دە ســــاڵەی دامەزراندنی تیپی نواندنی سلیمانیەوە بە هەڵمان زانی ئەم تۆمارە تایبەتیە دەربارەی گشت لایەنەکانی تیپی ناوبراو بخەینە بەردەستی ئێوەی بەرێز هیوادارین بەگوێرەی پێزی بابەتەکە خۆی توانیبێتمان تیشکێك بخەینە سەر هەوڵو تەقەلای ئەم تیپە لە رێگای پێش خستنی هونەری کوردیدا کە بە گوێرەی توانای خۆی لە هەوڵو تەقەلای خزمەت کردنی لایەنی هونــەری خۆیاندا کەم تەرخەمییــــان نەکردووەو ئەندامەکانی ساڵ لە دووای ساڵ زیاتر قۆڵی خۆ هیــلاك کردنو هەوڵی راستەقینەی لێ هەڵ کردووەو هەرچەنــدە ماوە درابن قسوریان نەکردووە ، هیوادارین جێگای رەزامەندی تیپی ناوبراوو هەموو خوێنەرانی بەرێزیش بێتو لە ســـەرەتاشدا پڕ بەدڵ سوپاسی هــەردوو هونەرمەند کاوە احمد میرزاو فاضل قەساب ئەکەم ، کەلە ئامادە کردنی ئەم تۆمارەدا یارمەتیەکی باشیان دامو ئاواتە خوازم وێنەیان زۆربێت بۆ خزمەت کردنی هونەری نەتەوەکەمان .

● ڕا گوزاریەکی خێرا بـــە مێژووی دەساڵەی تیپ دا .

\+ لە ٤ـ٢ـ١٩٦٠ دا بە رەسمی دامەزرا

\+ یەکەم جار لە دوو بەشی ســـەرەکی پێك هات بەشی نواندنو بەشی مۆسیقا .

\+ بەبۆنەی دامەزراندنی تیپەوە لە ٢٦ـ٢ تــــا ٤ـ٣ـ١٩٦٩ تیپ ئاهەنگێکی هونەری ساز کرد ، کــە گۆرانی ومۆسیقاو گەلێ بابەتی ترو چیرۆکێکی خۆماڵی بە ناونیشانی « گیسك نیە بزنە »ی تیا پێشکەش کرا.



+ له ١-٩-١٩٦٩ بەشی مۆوسیقا له تیپ جیا بوومەوە .

+ بۆ یەکەم جار له مێژووی هونەری شانۆی کوردیدا تیپی نواندنی سلیمانی بەرهەمی له تەلەفزیۆندا تومار کردووەو یەکەم بەرهەمێ له تەلەفزیۆن تۆمار کرا چیرۆکی ( خواله سولتان محمود گەورەترە ) بو کەرۆژی ٢١-٣-٩٧٠ له تەلەفزیۆنی بەغـــدا تیپی ناوبراو تۆماری کردووە .

+ ١٠-٣-٩٧٠ یەکەم ژمارەی گۆڤاری ( تیشکی هونەری ) دەرکرد که شتێکی بەپێزی هونەری چاك بوو .

+ ٨-٨-١٩٧١ رژێمی نلوخۆیی تیپ گۆڕرا بۆ ئەوەی لەگەڵ رێرەوی تازەی تیپ دا بگونجێت .

+ ٢٥-٢-١٩٧٢ بوو که بە شانۆگەری ( شاخەوانی مەزن ) هاوبەشی میهرەجانی یەکەمی شانۆی کوردیان کردووە .

● ئامانجەکانی تیپ بە پێی سفتی دووەم لـــە ماددەی یەکەمی رژێمی ناوخۆی تیپ بریتیە له مانە :-

« بەشدار بوون له هۆشـــیار کردنەوەو خزمەت گوزاری کۆمەڵداو پشتگیری کردنی هەموو ئەو بیروڕاو ئامانجانەی کۆمەڵ پیرۆزی لێ کردووە ، هەروەهـــا بە شداری کردن له هاندانی بزووتنـــەوەی هولەری‌و رۆشنبیری‌و وێژە پیدا بەهۆی ساز کردنی ئاهەنگی شانۆیی‌و ئیستگەی تەلەفزیۆنی‌و سینەماوە ، هەروەها گێرانی ئاهەنگی مۆســـیقاو دەرکردنی گۆڤارێکـــی ناوبەناو بە ناونیشانی تیشکی هونەر » .

● وتەی تیپ له بەرنامەی یەکەم بەرهەمیدا

میوانانی خۆشەویست

سلاوی برایەتی و خۆشەویستی‌و دلـــسۆزی

خزمەت کردن‌و گەشانەوەی هونەری کوردی کـــە چەندەها ساله گەردی کەمتەرخەمی لێ نیشتووە ، ئیمڕۆ بە تواناو کۆششی هونەرمەندانی جگەر سۆز باراوی ئەکەین . هەتا ئێوە لەگەڵ ئەوەی داهاتوودا جێگای شـــانازیتان بێت ، ئەمەش بە دارشـــتنی بناغـــەیەکی بـــەهێزی هونەر ئـــەبێت له وڵاتـــی کوردەواریماندا ، هەرئەم ئامانجەش هانی داین بـــۆ پێك هێنانی تیپەکەمان کـــە نیازی بوژاندنـــەوەی هونەرە‌و هیچ ئامانجێکی تری نیـــە ، له کاتێکدا ئێمە ئەم ئاهەنگەمان ئەکەینە دەسکەگوڵی دەستمان‌و لـــە رۆژانی جەژنی پیرۆزدا پێشکەشتانی ئەکەین هیوامان زۆرە که ئەو مەبەستەی ئێمەی هێناوەتەکۆڕەوە بەرەو پێش مل ئەنێت بۆ خزمەتی ئێوەو دلنیاشین کـــە بەیارمەتی بەردەوامی ئێوە هەمیشە بەرەو پێشکەوتن ئەڕۆین .

دیسانەوە لەگەڵ پێشکەش کردنی ئەم ئاهەنگەدا ( که تەنیا له هەفتەیەکدا توانیمان بیهێنینە بەرهەم ) بانگی هەموو لایەك ئەکەین بۆ یارمەتی‌و پێشـــنیارو رەخنەی بەکەڵك . بە تایبەتی دوای ئەوەی تکا لـــە خوشکانی خوێنـــدەوار ودلـــسۆز ئەکەین که بێن لەگەڵماندا بەشدار بن‌و ئەرێتی چەوتی ئەمـــامی‌و پەرژینی ترس‌و لەرز بشکێنن‌و بێنە کۆڕی خزمـــەت کردنی گەلەوە . له ئێمەشەوە هـــەموو ســـوپاس‌و رێزگرتن‌و یارمەتیەك بە ئیش کردن‌و رەوشت بەرزی‌و پارێزگاری کردنی بەرزەوەنـــدی‌و شـــکۆی ئێوە . لەدواییدا داوا له یەزدانی گەورە ئەکەین که هەموو هاونیشتمانی‌یەکی بەکەڵك سەربخات له رێگـــەی خزمەت کردنی گەل‌و نیشتماندا .

**تیپی نواندنی سلێمانی**
**شوباتی ١٩٦٩**

● وتەی تیپ له دوابەرهەمیدا که پردی ئارتایە

دوا بەدوای تاقی کردنەوەکانی تیپ‌و قاڵ بوون له مەســـەلەی گرنگی شانۆو دەوری شانۆدا ، ئەوەمان کردۆتە پرۆگرام که تیپی نواندنی سلێمانی هەمیشە هەلگری دروشمی داهێنان‌و نوێ کردنەوە بێت‌و له رێبازێکی راست‌و دلـــسۆزانەوە بەئێوەی خۆشەویست بکات . ئەم بەرهەمەمان نموونەیەکی راستەقینـــەی دلـــسۆزی‌و هاوبەشـــی کردنە . ئەمانەوێ لـــە



بەرهەمەکانی تیپدا زیاتر ئەوە پیشان بدەین و لەسەر ڕێبازی بڕوامان بەهونەرو جەماوەر چەند تاقی کردنەوەیەك پێشکەش بکەین کە لە تەکنیك و ڕێبازی هونەریدا جیاوازن بەڵام هاو ئامانجن و یەك مەبەست کۆیان ئەکاتەوە لەرێ ڕەوی بزووتنەوەی هەموویان خزمەتی شانۆی کوردی ئەکا .

**تیپی نواندنی سلێمانی**
**کانوونی یەکەمی ١٩٧٨**

● ڕاگوزارێك بەدەستەکانی بەڕێوەبەری یەك لەدوای یەکی تیپدا لەگەڵ دەستەی دامەزرێنەری یەکەم جاریدا .

● دەستەی دامەزرێنەری تیپ :

١ ـ سمکو عزیز فرج
٢ ـ حسن حسین کریم
٣ ـ برهان عبدالکریم رشید
٤ ـ عمر علی امین
٥ ـ احمد سید محمود معروف
٦ ـ انور عمر قرداغی
٧ ـ نوری اسماعیل فتاح .

● یەکەم دەستەی بەڕێوەبەری تیپ لە ١٠ـ٢ـ٩٦٩ وە بۆ ٣ـ٤ـ١٩٧٠

١ ـ عمر علی امین
ـ سەرۆك .
٢ ـ انور عمر قەرەداغی
ـ سکرتێر .
٣ ـ احمد سید محمود معروف
ـ بەڕێوەبەری هونەری .
٤ ـ نوری اسماعیل فتاح
ـ زمێریار
٥ ـ سمکو عزیز فرج
ـ ئەندام
٦ ـ برهان عبدالکریم رشید
ـ ئەندام
٧ ـ حسن حسین کریم
ـ ئەندام

● لە بەرواری ٢٠ـ٨ـ١٩٦٩ دا کاك عمر علی امین وازی لە سەرۆکایەتی تیپ هیناو کاك انور توفی کرا بە سەرۆکی تیپ



● دووەم دەستەی بەڕێوەبەری تیپ لە ٤ـ٤ـ٩٧٠ وە بۆ ٢ـ٤ـ١٩٧١ .

١ ـ احمد دەنگ گەورە
سەرۆك
٢ ـ برهان مصرف
سکرتێر
٣ ـ کامل قادر
زمێریار
٤ ـ سمکو عزیز
ئەندام
٥ ـ حسن حسین کریم
ئەندام
٦ ـ عمر کریم فتح‌الله
ئەندام
٧ ـ صلاح فرج
ئەندام

● **تێبینی :**

(١) لە بەرواری ١٣ـ١١ـ١٩٧٠ دا کاك سمکو عزیز کرا بە سەرۆکی تیپ لە بەر چوونی سەرۆکی پێشووی تیپ بۆ بەغداد . هەروەها کاك عمر توفیق دڵپاك بە ئەندامی ( احتیاط ) ی دەستەی بەڕێوەبەر بوو کرا بە ئەندامی تەواوی دەستەی بەڕێوەبەر . .

(٢) لە بەرواری ٢٢ـ١١ـ١٩٧٠ کاك صلاح فرج لە بری کاك کامل قادر کرا بە زمێریاری تیپ .

(٣) لەبەرواری ١٢ـ١٣ـ١٩٧٠ دا کاك کاوە احمد میرزا کرا بە سکرتێری تیپ .







● سێیەم دەستەی بەرێوەبەری تیپ لە ٣-٤-٩٧١
ـ بۆ ٢٠-٤-١٩٧٣
- سمکو عزیز فرج
سەرۆك
- کاوە احمد میرزا
سکرتێر
- غازی بامەرنی
بەرێوەبەری هونەری
- کمال رشید شریف
ژمێریار
- طالب بەرزنجی
بەرێوەبەری ئیدارە
- برهان مصرف
ئەنـدام
- صلاح فرج
ئەنـدام
- عمر توفیق
ئەندام ( احتیاط )
- محمد علی نوری
ئەندام ( احتیاط )

● چوارم دەستەی بەرێوەبەری تیپ لە ٢١-٤-٩٧٣
ـ بۆ ٢١-٦-١٩٧٥
- سمکو عزیز فرج
سەرۆك
- کاوە احمد میرزا
سکرتێر
- طالب بەرزنجی
بەرێوەبەری ئیدارە
- غازی بامەرنی
بەرێوەبەری هونەری
- کمال رشید شریف
ژمێریار
- برهان مصرف
ئەنـدام
- صلاح فرج
ئەنـدام
- محمد علی نوری
ئەندام ( احتیاط )
- عمر توفیق دڵپاك
ئەندام ( احتیاط )

● وازهێنانی کاك طالب بەرزنجی قبوڵ کرا وکاك علی نوری کرا بە تەواوی دەستەی بەڕێوەبەر.

● پێنجەم دەستەی بەڕێوەبەری تیپ لە ٢٢-٦-١٩٧٥ وە بۆ ٤-٨-١٩٧٧

١ ـ سمکو عزیز فرج
سەرۆك
٢ ـ کاوە احمد میرزا
سکرتێر
٣ ـ غازی بامەڕنی
بەڕێوەبەری هونەری
٤ ـ کمال رشید شریف
ژمێریار
بەڕێوەبەری ئیدارە
٦ ـ برهان مصرف
ئەنـدام
٧ ـ عمر علی امین
ئەنـدام
٨ ـ محمد علی نوری
ئەندامانی احتیاط
٩ ـ نوزاد حسین
ئەندامی احتیاط
١٠ـ عمر توفیق
ئەندامی احتیاط

● شەشەم دەستەی بەڕێوەبەری تیپ لە ٥-٨-١٩٧٧ وە هەتا ئێستا

١ ـ سمکو عزیز
سەرۆکی تیپ
٢ ـ کاوە احمد میرزا
سکرتێر
٣ ـ صلاح فرج
بەڕێوەبەری ئیدارە
٤ ـ کمال رشید شریف
ژمێریار
٥ ـ غازی بامەڕنی
بەڕێوەبەری هونەری
٦ ـ عمر توفیق
ئەنـدام
٧ ـ محمد علی نوری
ئەنـدام
٨ ـ برهان مصرف
ئەنـدام
٩ ـ نوزاد حسین
ئەنـدام

● سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ کاك غازی بامەڕنی بۆ خوێندن چووە فەرەنساو لە بری ئەو کاك فاضل قصاب کرا بە بەڕێوەبەری هونەری تیپ .

● تیپی نواندنی سلیمانی ئەبووایە ناوبەناو گۆڤاری تیشکی هونەری بڵاو بکردایە تەوە ـ بەڵام داخەکەم تەنها یەك ژمارەی لێ دەرچــوو ئیتر نەمان دیەوە ، بۆیە هەر لە بەرتاقانەیی وا وێنەی بەرگو ناونیشانی ئەوبابەتانەتان ئەخەینە بەردەســت کە لەو ژمارە تایبەتیانەی تیشکی هونەردا بوون .

١ ـ بەرگی‌یەکەم وێنەی خوشکە گەزیزە بوو .
٢ ـ ئامانجی تیشکی هونەر    فەتاح کاوە
٣ ـ دەرهێنان    احمد محمود دەنگ گەورە
٤ ـ لێدوانێك لەگەڵ    مامۆستا هەردی
٥ ـ فۆلکلۆری نیگاری کوردی    عومەر عەلی ئەمین
٦ ـ چەند پرسیارێك لە ئەدیبو نووسەری بەناوبانگ شاکر فتاح
٧ ـ ستانسلافسکیو رەوشتەکانی شانۆ    حەسەن تەنیا
٨ ـ چیرۆکی ژمارە ( بەناوات گەیشتو ) ئاوارە
٩ ـ وردەواڵە .
١٠ـ دەرویش عبدالله ( هۆنراوەی گۆران ) .
١١ـ دەمە    تەقێیەك لەگەڵ خوشکە گەزیزە
١٢ـ لەبەر نازی چاوبازان ( هونراوە ) وەفایی
١٣ـ ئافرەتو شانۆ ( هونراوە )    حمە رشید هەرەس
١٤ـ پرسیارو وەڵام
١٥ـ هەواڵێك لە دانیشگای سلیمانیەوە .

● هەر بە بۆنەی دامەزراندنی تیپەوە بەهەلم زانی کەڕای هەندێ هونەرمەنـدان وەر بگرمو هەنـدێ پرسیاریان ئاراستە بکەم والێرەدا وتەو دەمە تەقێی هەندێ لە هونەرمەندانتان پێشکەش ئەکەین .

● هونەرمەند مصطفی قەسیم ئەندامی تیپ بەم بۆنەیەوە ئەڵێ : ـ

+ گومان لەوەدا نیە کە هەر هونەرمەندێك جۆرە ڕێگایەك دەست نیشان ئەکات بۆ خزمەتی هونەرەکەی وئاواتی سەرکە وتنیشی بۆ ئەخوازێ ومنیش ئەم ڕێگایەم گرتۆتە بەرو ئامانجیشــم ئەوەیە کـەوەك هونەرمەندێکی ڕاستەقینەی دڵسۆز بێمە پێشەوە ،

له ناخمەوە پێ‌وچان بم لە خزمەتی شـــانۆی کوردی ڕەسەندا ونەوەی پالێ پێوەنام بچمە پەیمانگا ئەوەیە کە خزمەتی هونەرە کەمان بەشێوەیەکی ڕاستەقینەو زانستانە پێبگەیەنین‌و بناغەی شانۆکەمان بەبارمەتی هەموولایەك لەسـەر زەویەکی پتەو دابرێژین .

● تیپی نواندنی سلیمانی کتێبخانەیەکی خنجیلانەی هەیەو هونەرمەنـــد عمر دلپاکیان کردووە بە لـــێ پرسراوی ئەو کتێبخانەیە ، کـە لە هونەرمەنـــدی ناوبراومان پرسی‌دەربارەی کتێبخانەکە وتی : ــ

+ ئاشکرایە کە هونەری کوردیمان جـار لەدوای جار پەرە ئەسێنێ‌و هەنگاو بەرەو پێشەوە ئەنێت .. جا بۆئەوەی ڕێگای بەرەو پێش چوونی ئەم هونەرە باشـــتربێ‌و بتوانرێ زیاتر خزمەت بە جەمـــاوەر بگەیەنرێت ، پێویستە لەسەر ئەو هونەرمەندانەی لەم بوارەدا ئیش ئەکەن بە هیوای ئەوەی شانۆیەکی ڕەسەنی کوردی بەرپا بکرێت‌و شارەزای یەکی تەواو لەرووی هونەری‌یەوە پەیدا بکات ولەرۆشـــنبیری هونەریدا خۆی قالْ بکات ، هەر بۆ ئەم مەبەستەش تیپەکەمان کتێبخـــانەیەکی جوان‌و خنجیلانـــەی ڕازاندۆتەوە بەجۆرەها کتێبی بەکەڵك لە شانۆگەری جیهانی جۆراوجۆرو لێکولینەوەو کتێبی هونەری تری بەنرخ بۆئەوەی ئەنـــدامان سوودی لێ وەربگرێت‌و بیخوێنێتەوە . وەلە ڕادەی رۆشـــنبیری لـــە ناو ئەندامەکاندا پرۆژەیەکی رۆشنبیریمان بە دەستەوەیە بریتی‌یە لە سازکردنی چەند کۆرێکی رۆشـــنبیری بۆ ئەندامانی تیپ ، لەم کۆڕانەدا دەست نیشانی ئەو خاڵە سەرەکیانە ئەکرێت کە ئەبنە هۆی پەرە پێدان‌و سەرکەوتنی شانۆی کوردیمان .

● هونەرمەند کاك فاضل قەســـاب بەرێوەبەری هونەری‌ی تیپەو ئەوە ماوەیەکە لـە کارکردندا گەلێ هەولێ تازەی داوە بۆیە هەندێ پرسیاریان ئاراسـتە کردوو دەرباری کارە هونـــەریە تازەکان لێمـــــان پرسی : ــ

● کاك فاضل قصاب

● ئەو بەرهەمانەی کە تیپ لە هەندێ موناسەبات‌دا پێشکەشی کـردوون

| ژمارە | ناوی بەرهەم | نووسەر یان ئامادەکەر | دەرهێنەر | شوێن‌و ڕۆژی پێشکەش کردن |
|---|---|---|---|---|
| ١ــ | کاوەی ئاسنگەر | جەمال بابان | احمد دەنگی گەورە | ١٩٧٠/٣/٢١ بەغداد ــ هۆلی خلد، بەبۆنەی رۆژی نەورۆزەوە. |
| ٢ــ | داوی مەرگ | هیو مونرو | غازی بامەرنی | ١٩٧٢ ئامادەیی سلێمانی کوڕان ، بەبۆنەی دابەش کـــردنی خەلاتی بابانەوە . |
| ٣ــ | نیو سەعات | عمر دلپـــاك | عمر دلپاك | ١٩٧٣ چالاکی قوتابخانەکان،بەبۆنەی رۆژی شانۆی جیهانەوە. |
| ٤ــ | چاوی کوردستان | امین میرزا کریم | غازی بامەرنی | ١٩٧٣/٦/١٧یانەی فەرمانەران ــ یادی دامەزراندنی یـەکێتی نووسـەرانی کورد . |
| ٥ــ | شاخەوانی مەزن | غازی بامەرنی | غازی بامەرنی | ١٩٧٤-بەغداد هۆلی خلد ــ میهرەجانی یەکەمی هونەری کوردی. |
| ٦ــ | ڕێڕەوی گەل | غازی بامەرنی | غازی بامەرنی | ١٩٧٥/١١/١٨ یانەی مامۆستایان . |
| ٧ــ | مالی شێتی‌ی | توفیق فیالی | فاضل قصاب | ١٩٧٨/٣/٢٧ چالاکی قوتابخانەکان . رۆژی شانۆی جیهانی. |

● بەرهەمەکانی تیپ کە تەلەفزیۆن تۆمارکراون

| ژمارە | ناوی بەرهەم | نووسەر یان ئامادەکەر | وەرگێڕ | دەرهێنەر | بەرواری تۆمارکردن |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ١ـ | خواله سوڵتان محمود گەورەترە | پەندی پێشینان | | احمد دەنگ گەورە | ١٩٧٠/٣/٢١ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ٢ـ | مشتەی ناوهەمانەکە کوشتومی | پەندی پێشینان | | عمر علی امین | ١٩٧٠/٣/٢١ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ٣ـ | د ەوەن‌بەئاشە | پەندی پێشینان | | عمر علی امین | ١٩٧٠/٣/٢١ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ٤ـ | مەکری ژنان | نجم‌الدین مەلا | | برهان مصرف | ١٩٧١/٢/١٢ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ٥ـ | لە چاپخانەدا | کاوە أحمد میرزا | | سمکو عزیز | ١٩٧١/٢/١٢ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ٦ـ | تاوان | کاوس زەنگەنە | | سمکو عزیز | ١٩٧١/٢/١٢ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ٧ـ | دڵۆ پێ خوێن | طە بابان | | طالب برزنجی | ١٩٧١/٢/١٢ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ٨ـ | نرخی ئازادی | عمانوئیل روبلس | طالب بەرزنجی | طـ | ١٩٧٢/٢/٧ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ٩ـ | قەیسەرت لە بیرنەچێ | | کاوە احمد میرزا | غازی بامەڕنی | ١٩٧٢/٢/٧ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٠ـ | بازرگانی شەر | کاوە احمد میرزا | | غازی بامەڕنی | ١٩٧٢/٢/٧ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١١ـ | هاورێ ونیۆ | طالب بەرزنجی | ---- | سمکو عزیز | ١٩٧٢/٤/٤ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٢ـ | ئافرەتی داوێن پاك | صالح یحیی | | غازی بامەڕنی | ١٩٧٢/٤/٤ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٣ـ | من کێم | ناظم حکمت | | برهان مصرف | ١٩٧٢/٩/٥ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٤ـ | پیری ئافرەشەر | ن/مولێر/ علی جولا | علی جولا | سمکو عزیز | ١٩٧٣/١/٦ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٥ـ | دزی زۆرزان | غازی بامەڕنی | طالب بەرزنجی | غازی بامەڕنی | ١٩٧٣/١/٦ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٦ـ | کۆتایی زۆردار | غازی بامەڕنی | کاوە احمد میرزا | غازی بامەڕنی | ١٩٧٢/٦/٢٣ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٧ـ | فیلەکەی خاوەن شکۆ | سعدالله‌و نووس | کاوە احمد میرزا | غازی بامەڕنی | ١٩٧٥/٧/٢٤ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٨ـ | فەضلەی .طەریق | عمر علی امین | | عمر علی امین | ١٩٧٥/٩/٦ تەلەفزیۆنی بەغداد |
| ١٩ـ | شەمامەو خاڵ‌خاڵ | عمر علی امین | | سمکو عزیز | ١٩٧٥/٩/٢١ تەلەفزیۆنی بەغداد |



وەك بەڕێوەبەری هونەریی تیپ چ دەوریکتان هەبووە لە هەندێ گۆڕانکاری تازەدا کە لەسەردەمی خۆیدا پەیڕەوی نەئەکراو بایەخی پێ نەئەدرا وەك دیکۆر ، رووناکی ، هۆڵ .

وەڵام :

هەموو سەرەتای دەست پێ کردنێك کە نیوە ناچڵ بێو نەلکێنرابێ بە تاقی کردنەوەی قووڵو دەوڵەمەندەوە ، ناتوانێ زۆر ئامانجو مەبەست بپێکی جا لەلایەن کەسێکەوە بێ یان لەلایەن تیپێکەوە . تاقی کردنەوە ، بریتی یە لە مێژووی هونەرمەندا ، تاقی کردنەوەی هەر تیپێکیش لایەنێکی مێژووی بزووتنەوەی شانۆیی کوردی پێك ئەهێنێ .

تیپی نواندنی سلیمانی لە قۆناغێکدا هاتە پێشەوە لەوە ئەچوو بەگژ سەردەمەکەیدا بچێ ، لە کۆمەڵێکدا ، دوا کەوتوو ، جێماو لە شارستانێتیو بێ ئاگا لەدنیای تەکنۆلۆژیا ، کەم تاقی کردنەوە لەزۆربەی بوارەکانی ژیانیدا ، تاقی کردنەوەی نشوستیو نەهامەتی نەبێ . تیپیش ... نەئەکرا هەر لە سەرەتاوە سەرکەوتنی تەواو بەدەست بێنێ وهەر شتە مافی خۆی بداتێ . لە گەڵ ئەوەشدا



کەچەند مامۆستایەکی شارەزاو کارامە ئیشەکانیان رایی ئەکردو خاوەنی تاقی‌کردنەوەی لەوەبەریش بوون . بەڵام هەموو تاقی‌کردنەوەکانی رابوردوو بەو جۆرە نەبوون کەوانەی زۆر گەورە بنو پێداویستی تازە بهێننەکایەوە . رەنگە جۆری کار کردنو بەدەنگەوە هاتنو بەربڵاوی کاری دوێنێو ئەمڕۆ لای هەمووان ئاشکرا بێ ، هۆی سەرەکیش مێژووی هونەرمەندو مێژووی تیپەکانە ، لەبەر ئەوەش کە ئێستا ئیش کردن هەمیشە بەردەوامەو بێ وەستانە ، هەر بەرهەمێك ئەبێتە پۆلێکی ئەکادیمی بۆ ئەندامانی تیپو بەرهەمی داهاتوو . تیپی ئێمەش وا (١٠) ساڵێ تەواوە لە تاقی کردنەوەیەکی بەردەوامدا ئەژی ولەگەڵ تیپەکانی تری کوردستاندا تاکە ئەکادیمیاو ئامۆزگای درامان تیایدا فێر ئەبینو تاقی‌کردنەوەکمان زۆر ئەکەین .

ئەو کورتە باسە رووناکی یەك ئەداتە سەر چونیەتی مامەلە کردن لەگەڵ هەندێ رەوشتی شانۆیی .

رەنگە لەسەرەتادا هەموو هەوڵێکی تیپ لە مەسەلەی رووناکی‌دا ئەوە بووبێت کە شانۆکە رووناك بکرێتەوەو لەشو رووی ئەکتەرەکان دەرکەوێ ، هەر چەندە کەرەسەکانیش کەرەسەی راستەقینەی شانۆ نەبوونو لەلایەن ئەندامانی تیپەوە دروست کرابوون ، بەڵام لەگەڵ زۆر بوونی تاقی‌کردنەوەکانی تیپدا رووناکی بە جۆرێکی تر بەکار هێنراو هەر برۆجکتەرێك دوایباسو لێکۆڵینەوە شوێنی خۆی ئەگرێ . هەروەها سەبارەت‌دیکۆریش ، کەسێکی شارەزا دیاری

ئەکرێ‌و راوێژ لەگەڵ دەرهێنەر ئەکاو لەماوەی دیاری کراودا بەپێی گەورە و بچووکی‌و پێوانەی ئەو شانۆیەی لەسەری پێشکەش ئەکرێ دیکۆرکێش نەخشەی دیکۆری شانۆگەری‌یەکە پێشکەش ئەکا ئینجا لەسەر ئەو نەخشەیە کەدەرهێنەر پەسەندی ئەکات پراوەی شانۆگەری‌یەکە دەست پێ ئەکا . وانیازە لە بەرنامەی کاری تیپدا لەمەودوا زیاتر برەو بەو مەسەلەیە بدرێت‌و کەسانێ هەبن کە پسپۆر بن لە نەخشە دانان‌و جێ‌بەجێ کردنی دیکۆردا .

دەربارەی رێکخستنی هۆڵ ، لە سەرەتادا جیاوازی بۆ قوتابیان پێشکەش ئەکراو رۆژێك بۆ ئافرەتان ، رۆژێك بۆ کاسب‌و ئابەو جۆرە . تاقی کردنەوەکانی تیپ ئەو جیاوازی‌یە چینایەتی‌و پیشەیی‌یەی نەهێشت‌و ئێستا هەموو کەس لە ئافرەت‌و پیاو دێنە هۆڵەوە بێ هیچ جیاوازی یەك .

ئیتر هێشتا ئاواتی گەورەو پیرۆزمان لەبەر دەمایەو هیواداریت بتوانین بەجێ‌یان بێنین‌و هونەرەکەمان برازێنینەوە .



● هونەرمەندی ناسراو مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی کاتێ خۆی لە دەستەی دامەزرێنەری تیپی نواندن‌و مۆسیقای سلیمانیدا بوو بۆیە لەم یادەدا بە پێویستمان زانی هەندێ بیرەوەری خۆیمان بۆ باس بکات :

+ هەر لەگەڵ دروست بوونی تیپی نواندن‌و مۆسیقای سلیمانیەوە گەلێ بیرەوەریم لەگەڵیمان دا هەیەو لێرەدا ئەڵێم : ـ

ئەو بەرهەمانەی کە لە ساڵانی ١٩٦٣وە هەتا ساڵانی ١٩٦٧ پێشکەش ئەکران بەرهەمی قوتابخانەکانی شاری سلیمانی بوون ، وە ئەو بۆشای یەی کە لە کاری هونەریدا هەبوو هەوڵ ئەدرا ئەو دیۆە پڕ بکرێتەوە ، دروست کردنی تیپێکی هونەری ئاواتی هەموو هونەرمەندێکی شاری سلیمانی‌بوو بەجۆرێ بتوانێ بەئاشکرا کاری هونەری خۆی بکات وە کەس رێگای ئەم کارکردنەی لێ نەگرێ ، پاش ئەوەی کە کۆمەڵێ هونەرە جوانەکان داخرا . لەو ماوەیەدا هەولیك هاتە پێشەوە بۆکارێکی هونەری‌گەورە ئەوەش دەرهێنانی فلیمێکی سینەمایی بوو .. بەڵام لەبەر کەم دەرامەتی نەتوانرا ئەوکارە بێتە دی‌و جێ بەجێ بکرێت .

ئەوەبو پاش ئەوەی بناغەی تیپی مۆسیقای سلیمانیان دامەزراند لەگەڵ برادەرە هونەرمەندە مۆسیقیەکاندا لەگەڵ چەند هونەرمەندێکی تر کە بەهونەری نواندنەوە خەریك بوون داوایەکمان پێشکەش بە وەزارەتی رۆشنبیری‌و راگەیاندن کرد بۆ ئەوەی بەرەسمی رێگەمان پێ بدەن بۆ دروست‌کردنی ( تیپی نواندن‌و مۆسیقای سلیمانی ) ئەمەش ساڵی ١٩٦٨ هاتەدی وە برادەرانی تیپی مۆسیقا بوونە ئەندام لەم تیپەدا ، وە بە گیانێکی لە خۆبووردن و لە گەڵ برادەرە هونەرمەندەکانی نواندن دەستیان کرد بە بەرهەم پێشکەش کردن ، تەنانەت یەکەم بەرهەم پاش ماوەیەکی زۆر کورت بوو کە رێکەوتی‌جەژنی قوربانی پیرۆزی ئەکرد بەیانیان‌و ئێواران ئەو پرۆگرامەی ئامادە کرابوو پێشکەش ئەکرا لە سەر هۆڵی ئامادەیی کوڕانی سلیمانی ، پاش ئەمەش چەندەها بەرهەمەی رەنگاورەنگی تر پێشکەش کرا لە سلیمانی‌و هەولێرو بەغدا و هەموویشیان سەرکەوتو بوون ، بێگومان نواندن‌و مۆسیقا پەیوەندیەکی زۆریان هەیە پێکەوە ، بەڵام جۆری هێنانەدی کارە کەوپەێویستی هەریەکەیان‌و بۆچوونی

هەر لایەك بۆ بەرهەم هێنان ئاڕادەیەك جیاوازی هەیەو هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو بەرەزامەندی هەمــــوو برادەرانی تیپ بڕیاردرا تیپی مۆسیقا لە تیپی نواندن جیا ببێتەوە وئیتر دوای وەرگرتنی ئیجازەی تیپی مۆسیقای سلیمانی هەردوو تیپ پێکەوە دەستیان کرد بە ئیش کردن وپەیوەندی زۆر بەتینیان هەبووە وبۆ بەلگەش چەندەها بەرهەمیان پێشــــکەش کردووەو هەرلایەیان زیاتر لە کارەکەیدا ڕەسەنایەتی هونــەری کوردی بەکار ئەهێنا .

ئێستاش ئەم تیپە پاش ئەوەی دەساڵ لــــە تەمەنی بردە سەر لەخۆشیو ناخۆشیدا کۆلی نەداوە لەخزمەت کردنی هونەری کوردەواری ماندا وبەیەکێ لە تیپە هەرە چاکـەکانی هونەری کوردی ئەژمێررێت کەهەمیشــــە لەخۆی بوراوە بۆ ئەوەی بەرهەمێکی چاکترو کاریگەر ترو جوانتر پێشکەش بە جەماوەر بکات ئیتر چی لەڕێگای ئیستگەو تەلەفزیۆنەوە بێت یاخۆ لە ڕێگای شانۆوە بێت . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە هەموو ئەندامانی تیپەکە بە گیانێکی برایەتــــی وهەست بەلێپرسراوی خۆیان ئەکەن بەرامبەر بەو هونەرەی پێشــکەشی ئەکــەن .. وابزانم زۆریش ئاشکرایە کە هەولێ ئەم تیپە زۆر کاریگەر بووە بــۆ هاندانی زۆر گەنج ولاوی کورد کە بچنە پەیمانگای هونەرە جوانەکان بۆ تەواو کردنی خوێندنی شانۆو لایەنەکانی تریش. لە کۆتاییدا ئەلێم هەر سەرکەوتویی بۆ خزمەتی هونەری نەتەوەکەمان .

● هونەرمەند ئەحمەد سالار ســەرۆکی تیپــی پێشرەوی شانوی کوردی لەم بیرەوەریەدا ئەم چەند دێرەی پێوتین .

+ دە ساڵ لەمەوبەر لەشارە شیرینەکەی باوەش چیاگەردن گەشەکاندا کە لوتکەی بەباڵای پیرەمەگرون بالۆێزیانە لە پایتەختی وڵاتی هەورو ئاسمانا ..... دەرختێکی سەوز ژیا لەدایك بوو ، باڵەکانی کردەوە بۆ بوون بە هێلانەو پەنای ئارام گرتنی باڵندە نــەرم نیانەکان لەسای ســــێبەریا بوژانەوە ئاهی هیــوا بەگیانیانا هاتەوە ، ماندوێتی یان دەرچوو ، دڵنیایی نایە تۆی پریاسکەیانەوە .

پێش دە ســــاڵ بایوەشــــێ شنەی کردوو شکۆفەی پێداو هێنایە خەندە ، نۆبەرەی نایە بەرخچەی دۆستانەوە بە نیازی دیاری مرگێنیو گۆێزە بانــــەی بەشرایەوە ... چاوی هەڵهاتوو کەوتە سەرخولیاو خەیاڵی هاورێیەتی لەتەك گشت جوانیەکانو کەڵکە لەی خۆشەویستیو دلداری خۆرو باران لەکەلەی داو لە خوێنیا گەرای دانا .

دە ساڵ لەمەوبــــەر ڕۆژ ژمێرێك هەنگــاوی خستەوەو بووەکانی یەك بووە سەر چاوەیەکی ڕووناكو ڕۆوشن ، سەراپا وەرزەکانی کێلگەکانی کردە بەهاری کچی جوانی ... سرود ڕووا ، چاو چەپکــەگوڵێ بوو ، بەبەرۆکی هەرزەکارە بێ ســروەتە شەیداکانی ڕێگــای بەردەوامیـــــەوە بوو ... خۆزکـــــە لەشەقەی باڵی سەربەستی داو سنورەکانی لەخەوی ڕێگــای بەردەوامیـــــەوە بوو ... خۆزگــــــە کێووکەژی بلندا زوڵاڵیان لێدەزرنگایەوە .. هاورێکانم ئەم بەیتە داستانی سوارێك بوو کە دەساڵە هەنگاو دەنێ ... بە سەر هاتی دەساڵەی کۆرپەیەك لەدایك بوو بانگیان بەگوێـــدا چریکان بە تیپی نوانـــدنی سولەیمـــانی ... دەك پیرۆز بێت گوڕی بەگوڕی بەگوڕتری پاش دە ساڵە .

● هونەرمەند مامۆستا عەلی جۆڵا ســـەرۆکی کۆمەلی هونەرو وێژەی کوردی ــ مەڵبەندی سلیمانی وتی : ــ

+ لە ئارەقی نێو چەوانی ئەکتەرەکان گوڵێ<br>
لە ناخی پاكو پیرۆزی هونەرمەندان گوڵێ<br>
لە هیوای دوارۆژێکی ڕووناكو ئاسۆیەکی نوێ گوڵێ

لە دەروونی پاكو بێ گەردی هونەرمەنــدانو بەردەوامی بەرهەم گوڵێ : ــ

بۆ سەر تەمەنی پیرۆزی تیپی نواندنی سلیمانی لە گەڵ ریزی هونەرمەندانی کۆمەلێ هونەروو وێژەی کوردی ــ مەڵبەندی گشــتی سلیمانی ــ پێشکەش ئەکەینهیوای سەرکەوتنو بەردەوامیتان بۆ ئەخوازین کە ئەو چرا نازدارەی هونەری کوردی هەردەم ڕوناکی بدات بە جەماوەری کوردمانو لەگەڵ هەموو چراکانی تردا ، ڕێچکەی خزمەت گوزاری بەرنــەدا تا بۆنو بەرامەی بەرهەمەکانتان هەموو شوێنێك بگرێتەوە ، ئەم سەردەمەی پێ ڕووناك کەینەوە ، سوتەمەنیەکەش ئەو هونەرمەنـــدە لەخۆ بوردوە بــە جـــەرگانەن کەهۆشـــیارانە قۆڵ ئەکــەن بـــەقۆلییەکداو تێ ئەکۆشــن تابـــەر پێیــان ڕووناك بێتـــەوە ، ئـەو تـەمو مژەی باڵـــی کێشــاوە بەســـەر هونەری کوردیدا ڕای ماڵێ تابتوانن بناغەیەکی ڕەسەنو



پێەو بۆ هونەری نەتەوەکەمان دانێن بۆ ئەوەی لەکاروانی شادمانیو خۆش گوزەرانی نەتەوە بەختەوەرەکانی جیهاندا دوانەکەوین ، جارێکی‌تر لە کانگای دڵەوە پیرۆز بایێتان لێ ئەکەین ، ئاواتمان تەمەنی درێژتانە . رێزو سڵاو بۆ ئەوانەی کاروانی هونەری کوردی رەسەن بەرەو پێش ئەبەن ، سڵاو بۆ هەموو هونەرمەندێکی ڕاست گۆو لەخۆ بوردو کەئامانجی پێش خستنی هونەری کوردیە .

● لەهونەرمەند عبدالله محمود مان پرسی خۆشەویست ترین دەورتان لەگەڵ تیپی نواندنی سلیمانیدا چی‌بووە ؟ . ئەویش ووتی .

+ خۆشەویست ترین دەورکە لەگەڵ بەرهەمەکانی تیپەکەماندا بینیومە دەوری کرێکارێك بوو لە شانۆگەری پردی ئارتادا .

● بۆچی ئەم دەورەت بەخۆشەویست ترین دەورهەڵ بژارد .

+ چوونکە ئەکتەرێك بووم بۆ تەواوکردی شانۆگەریەکە ، هەرچەندە دەورەکەم بچووك بوو ، بەڵام لام خۆشەویستبوو ، چوونکە ئەکتەر تادەوری بچووك نەبینێت ناتوانێت دەوری گەورە ببینێت .

● حەرج ترین هەڵوێست هاتبێتە رێگات کامە بووە .

+ لە کاتێ پێش کەش کردنی پردی ئارتادا کارەباکەمان لێ کوژایەوە زۆریان لاگران بوو بەڵام بەردەوام بووین تاکارەبا هاتەوە .

● هەر ئەوپرسیارانەی سەرەوەمان ئاراستەی هونەرمەند ئازاد بەرزنجی کردوو ئەویش وتی .

+ دەوری شاگردی وەستا لە شانۆگەری داوێن پاکدا خۆشترین دەوربووە کەلە بەرهەمەکانی تیپ دا دیومە .

+ بۆ حەرج ترین هەڵویست ئەوەم بیرکەوتەوە کەرۆژێك هاتم‌بۆ بارەگای تیپ ، تەنها کاك فاضل قەساب لەوێ بوو ئەویش نوستبو منیش لەژورێکی تردا دانیشتم کە هەڵسام سەیر ئەکەم کاك فاضل رۆشتوەو دەرگاکەشی داخستوە ، بەراستی نەمزانی چی‌بکەم هەتا بیری تەلەفۆنەکەم کەوتەوە ، بۆنەگبەتی تەلەفۆنم کرد بۆ نشاط وام زانی کاك فاضل لەوێیە کەچی‌کەس هەڵی نەگرت ، وە للا ئیتر مەجبور تەلەفۆنم کرد بۆماڵی دراوسێیەکمانو هاورێ یەکم نارد کاك فاضلی دۆزیەوەو هات و دەرگاکەی بۆ کردمەوە جا ئەگەر تەلەفۆنەکە نەبووایە ، ئەوا ئەو شەوە لەویا بەندی کاك فاضل ئەبووم .

● لەم یادە پیرۆزەدا حەزمان کرد هونەرمەندان ببینین لە دەرەوەی تیپو رایان وەرگرین . جایەکێك لەو هونەرمەندانەی کەچاومان پێ کەوت هونەرمەند کاك فەرەنسیس داود بوو ئەم هونەرمەندە مۆسیقا ژەنە لە تیپی مۆسیقای سلیمانیو بەم بۆنەیەوو وتی .

● بە بۆنەی تیپەر بوونی ١٠ ساڵ بەسەر دامەزراندنی تیپی نواندنی سلیمانی دا پێخۆشحاڵ گەرمترین پیرۆز بایی پێشکەشی هەموو ئەندامانی تیپو هەموو هونەرمەندانو هونەر دۆستان بکەم .

یەکەم بەرهەمی ئەو تیپەم لەیادەو بە شانازیەوە سەیری یادی ئەکەم ئەویش ئەو ئاهەنگە قەشەنگە بوو کە هەردووای روخسەت دانانی تیپ لە هۆڵی ئامادەیی سلیمانیدا پێشکەشی کرد ئەویش بریتی بوو لەچەند گۆرانیو پارچە مۆسیقاو چەند کورتە چیرۆکێکی تەمسیلیو هەندێ شتی کوتوپری تر . لێرەدا ئەمەوێ بڵێم تیپی نواندنی سلیمانی یەکەم تیپەکە مۆسیقا هاوبەشی کات لەبەر هەمەکانیدا ( جگە لە مۆسیقای تصویری ) ، ئەمەش هەر لە سەرەتای دروست بوونیەوە بووە هەتا ئێستاش لەدووا بەرهەمیدا کە پردی ئارتا بوو . هونەرمەند ( غازی بامەرنی ) کە ئێستا لە دەرەوەی وڵات ئەخوێنی دەورێکی شیلودیاری لە پێشکەوتنی ئەم تیپەدا هەبوو .

ئەوەش جێگای شانازیە تیپی نواندنی سلیمانی

خاوەنی رۆڵ رەوێکی گەورەی لە بزوتنەوەی شانۆی کوردیدا بینیوە تا ئێستا بەرەو پێشـــەوە ئەرواتەو هۆکەشی هۆی دلسۆزیەو لە خۆبوردنی ئەندامەکانی لی ودواجار هیوای سەرکەوتن و پێشکەوتنیان بـــۆ ئەخوازم و دیسان پیرۆزباییان لێ ئەکەم .

● هەمدیسان هونەرمەند مامۆستا عثمان خـال وتی : ــ

+ هەرچەندە مـــن ئەندام نیم لە تیپی نواندنی سلیمانی‌دا بەلام گەلێ‌هۆی تایبەتی نزیکی خستومەتەوە لەگەڵیان وشارەزایان بووم . لە نێوان ئەم تێکـەڵ بوونەم دا ، ئەوەی مـن هەســـتم پێ کردبێت لــــە رەفتاری ئەندامەکانی‌دا ئەوەیە کە هەموویان هەست بە دلسۆزی و ئەمەکداریەو بەر پرسیاری ئەکەن‌و لە فەرمانی یەکتری دەرناچن ، گەلێـــك جار سەرنجم داوەتە هەموویان لەکاتێك دا کە پرۆژەیەکی نواندنیان بە دەستەوە بێت ، یان خەریکی کار کردن بن ، هەموو پێکەوە بەدڵ‌و بەگیان بەرەو رووی کارەکەیان ئەچن‌و بۆ جێبەجێ کردنی هەروەکو هەنگ بەیەکـدا دێن‌و دەچن !! . تیپی نواندنی سلیمانی دە ساڵە دامەزراوە ئەندامەکانی‌لە بیست هونەرمەند تێ ناپەڕێ ، لە ماوەی دروست بوونیانەوە تائێستا گەلێ بەرهەمی چاکیان پێش کەش بە کۆمەڵی کورد کردووە ، جـەماوەریش هەمیشە چاوەڕوانی بەرهەمەکانیان ئەکەن وهەرگیز چاویان لێ تێرنابێ چونکە هەر بەرهەمێکیان بکری ، پڕە لە ئامۆژگاری‌و رێنمایی بۆ کۆمەڵکامان لە رووی ســـیاسی‌و کۆمەڵایەتی لەبەر ئەوە بەهەســـتێکی راستەقینەو بەدڵێکی پڕ جۆشەوە پیرۆز بایی یادی دەساڵەی لەدایك بوونی ئەم تیپە نازدارە ئەکەم . .

● کاك ماهر علی محمدی هونەرمەنـــد ئەندامی تیپی نواندنی سلیمانی لەیادی ١٠ ساڵەی دامەزراندنی تیپە کەیاندا ئەڵێ : ــ

+ وەکو ســــەرەتایەکی دەست پێ‌کردنی ژیانی هونەریـم تازە هاتومەتە تیپی نواندنی ســــلیمانی‌و شانازی پێوە ئەکەم کـە لە یەکەم بەرهـەمدا کـە شانۆگەری پردی ئارتابوو هاوبەشیم کرد و دەوری یاساولی دووهەمم وەرگرت‌و خۆشەویست‌ترین دەور ئەبێ لەلام چونکـــە سەرەتایەکـــە بۆبڕینی قۆناغی گەورەترو سوپاسی برایانەی تیپ ئەکەم کە ئــەو رێگەیان بۆ کردمەوە کەئاواتی چەند ساڵەم بێتەدی .

● دەستەی بەڕێوەبەری تیپی نواندنی سلیمانی لە یادی دەساڵـــەی دامەزراندنیاندا چەپکەگوڵی بۆن‌خۆش وەفادارانە ئەخەنە سەر گۆری هەریـــەک هونەرمەندی خوالێ خۆشـــبو علی دلخۆش‌و ئازاد حسین‌و ئەوزاد حسین کە کاتی خۆی ئەندامی ئـــەم تیپـەبوون‌و لە بەرهەمـــەکانی تیپ دا هاوبەشیان کردووەو پڕ بەدڵ‌و لەناخیانەوە پەیمانیـــان بۆ تازە ئەکەنەوە کە رێگای دیاری کراوی راستەقینەی پێش خستنی هونەری رەسەنی کوردی بگرن‌و ئاواتەکانی ئەوان بهێننە دی وەداوای بەهەشتی بەرینیان بـــۆ ئەکـەن .

ئێمەش لەم یادەدا هەزار سلاوی بۆنداز ئاڕاستەی گیانی پاکی ئەو هونەرمەندانە ئەکەین‌و داوای خۆش گوزەرانی ئەو دنیایان بۆ ئەکەین‌و سلاو لە هەموو ئەو هونەرمەندانەی کورد کە سەربازی نەناسراوی رێگای پێش خستنی هونەری کوردی بوون .

● مامۆستای هونەرمەند کاك حسن تەنیا یەکێك بووە لە دەستەی دامەزرێنەری تیپی مۆسیقاو نواندنی سلیمانی بۆیە لەم یادە پیرۆزەدا چوینەلای ئــــەو هونەرمەندەو گوێمان لێ‌گرت‌و بەم بۆنەیەوە وتی .

+ تیپی نواندنی سلیمانی بەخواستی پاك‌و هەوڵی دلســۆزانەی هونەرمەندانی شارە خۆشەویستەکەمان لە رۆژی ٤ـ٢ـ١٩٦٦دا ناوێتەی هەموو ئەولایەنــە خزمەتگوزارانە بو کە توانلو لێ هاتوویی لاوە خۆین گەرمەکانی لە ئامێز گرتبوو لە پێناوی هێنانەدی دوا رۆژێکی باشترو دەستە بەرکردنی ژیانێکی پڕ لــــە کامەرانیا بۆ گـــەل ئـــەوە بوو کــە لــە پێشا ناوی



( تیپی نواندنو مۆسیقای سلیمانی ) بوو ، زۆر ئاهەنگی تەشەنگو شانۆگەری پێشکەش بەجەماوەرانی سلیمانیو دەرەوەی کرد ، بەڵام دوای ماوەیەك وا بە باش زانرا کە تیپی مۆسیقا سەربەخۆ ئیش بکاتو ، ئیتر مایەوە تیپی نواندن کە بەردەوام بوو لەپێش کەش کردنی شانۆگەری تەشەنگ ، چی لە سەرشانۆو چی لەسەر تەلەفزیۆن و بەکۆڵ نەدانی ئەندامە دلسۆزەکانی توانی لەزۆر شوێنی ولاتا بوونی خۆی بسەلمێنێو شوێنی شانازی هەموو ئەو کەسانەبێ کە دلسۆزن بۆ پێش خستنی هونەری کوردی .

لەیادی دەساڵەی دامەزراندنی تیپی نواندنی سلیمانیدا هەزار رێزو سڵاوم بۆ هەموو ئەندامانو لایەنگرانی کە هەتا ئێستا بەردەوامن لەکاروانا .

خۆشەویستیو خواستی سەرکەوتنم بۆ هونەری شانۆی کوردیو هەموو ئەوانە کە لە شانۆدا وانەی راستی ئەڵێنەوە . نەمریو سەربەرزی بۆ هەموو ئەو گوڵو خونچانەی کە لە باخچەی هونەرا هەڵوەرینو چوونە ریزی ئازادو نەوزادەوە .

● هەروەها هونەرمەند کاك برهان مەصرەفیش هەر لەو هونەرمەندانەبوو کەبوونە دەستەی دامەزرێنەی ئەم تیپەو لەم یادەدا ئەڵێ : ــ

+ تیپی نواندنی سلیمانی ئەو تیپەیە کە هەر لە لەدایك بوونیەوە هەوڵی‌خۆی تەرخان کردووە وکۆڵنادات لە کۆششدا بۆپێش خستنی هونەری رەسەنی کوردی و پێش کەش کردنی بەرهەمی مرۆڤایەتی هەروەها پەیمانی داوە کەلە مەولاش بەردەوام بێت لەورێبازە پیرۆزەدا کەگرتویەتی بۆگەشە کردنی شانۆی کوردی . لەماوەی ئەم دەساڵەی تەمەنیدا گەلی بەرهەمی نایابی پێشکەش کردووە هەر وەها گەلی هونەرمەند شۆرە سوارانە ئیشیان تیا کردووە بۆ خزمەت کردنی گەلەکەمانو بەکە ئاواتی منیش ئەوەیە کە هەموو برایەکی هونەرمەند لە کوردستاندا هەوڵ بدات بۆبە رزکردنەوەی رادەی هونەری نەتەوەکەمان بۆ رادەی هونەرە پێش کەوتوەکانی جیهان وئەمەش بەیەکگرتنی هەموو هونەرمەندانی کوردستان ئەبێتو بایەخ دانیش بە مناڵان هەر هۆیەکی‌چاکە کە بتوانین هەر لە مناڵیەوە هونەرمەندانی بەتوانا دروست بکەین چونکە مناڵان

**پێویستە لەسەر هەریەکێك لەئێمە لە پەیوەندیەکانیدا لەگەڵ میللەت مامۆستاو قوتابی بێ**

صدام حسین

باشترین کەرەسەی پێش‌خستنی هەموو لایەنەکانی ژیانن .

● ئێمەش لە کۆتایی ئەم تۆمارەدا هەزاران سڵاوی بۆ نخۆش ئاراستەی هەموو هونەرمەندانی تیپی نواندنی سلیمانیو هەموو هونەرمەندانی کورد ئەکەینو هەمیشە هیوامان سەرکەوتنیانە بۆ پێش خستنو گەشەکردنی هونەری رەسەنی کوردیو گەیاندنی ئەم هونەرەمان بە قافلەی هونەری نەتەوە پێش کەوتوەکانو هەزار سڵاو لەوانەی‌کەلەم رێگایەدا وەکو مۆم سوتانو سەربازی نەناسراو بوون .

تێ بینی

کاتی خۆی رای هونەرمەند مامۆستا عمر علی ئەمینو خوشکە گەزیزەمان وەرگرت ، بەڵام پێش چاپ کردنی ئەم تۆمارە لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی راکانی خۆیان وەرگرتەوەو رازی نەبوون بلاوبکرێتەوە وەکو هونەرمەندی ئەو تیپە من لە بیرم نەچوون ! .

*

# جۆری بابەت کردن لە نێوان فەلسەفەی (بیکۆن) و فەلسەفەی (هیگل)دا

نووسینی: د. احمد بدر
وەرگێڕانی: فؤاد عبدالرحمن



زۆر لە فەیلەسوف و مێژووناسەکان لە بارەی بابەتکردنەوە ئەڵێن ، کەوا « بابەتکردنە دەبێ » یەکەی مێلڤیل دیوی ، ڕاستکردنەوەیەکی « بیکۆنیەکی ئاوەژووە » Inverted Baconion کە لە سەرەتادا بابەتکردنی ولیەم تۆری هاریس بووەو بیکۆن ئاوەژووەی کردۆتەوە .. هەروەها بە هۆی بەکارهێنانی بیروڕاکانی بیکۆن لەلایەن دیوییەوە .. ناوبانگی بیکۆن بەوە دەرچوو کە کارێکی گەورەی لە ڕێکخستنی « ببلیوگرافیا »دا نواندوە .. بەڵام هەندێ لە زانایانیتر ، ئەوە ڕانەگەیێنن و بە بەڵگەی هێزدارەوە ئەڵێن کەوا « بابەتکردنی دیوی » لەلایەن بابەتکردنەکەی « هاریسەوە » کاری تێکراوە .. لەگەڵ ئەوەشدا هاریس خۆی لەلایەن فەلسەفەی « هیگل »ەوە کاری تێکراوە نەك لەلایەن بیروڕاکانی « بیکۆن »ەوە .

بیکۆن جیهانی وەك هەبوونێکی ( کۆیەکی ) تەواو ناساندووە . هەروەها ئەڵێ : ئەو (دیاردەیەی) کەوا ئەو ( کۆ )یە لێی پێکهاتووە ، پێویستە لە ڕێگەی زانستکۆو تاقیکردنەوەو هەڵسەنگاندنەوە بیگەیێنێ . بڕوای وابوو کەوا ـ لێکەڕان ـ بنچینەی زانستی نوێیە کە پێویستە لە ڕاستیەکانی تێڕوانین و تاقیکردنەوەوە دەستپێبکات .

هەروەها ئەڵێ کە سەرچاوەی هەموو هەڵەیەك لە بوونی خەڵتەو ناکۆکی لە هۆشی ئادەمیزادا پەیدا بووە .. کاری سەرەکی ـ لێکەڕان « الاستقراء » ـ یش یارمەتیدانە لە خاوێن کردنەوەی بیرو هۆش . هەروەها هەندێ هەڵەی گەورە گەورە هەیە کەوا ڕێگا لە پێشکەوتنی هۆشی مرۆڤ ئەگرێ . ئەو جۆرە هەڵانەشی ناوناوە ـ بتەکان ـ Idols .

ئەم هەڵانەش ئەگەڕێتەوە بۆ :

١ ـ ئەو زمانەی کە مرۆڤ لەگەڵ کەسانی دەوروبەری خۆیدا بەکاری ئەهێنێ و ناتوانی لە جێگای خۆیدا لەمبیرێکی ڕاستی پێ بکات . ( پێ لێك بداتەوە )

٢ ـ پەنا بردنی مرۆڤ بۆ جێباوەڕان ، لەو بیرە پووچەوە کە ئەوترێ ـ زانستە سەرەکیەکان لە مێژەوە دۆزراونەتەوە ـ خوێنەوار تەنها ئەوەی لەسەرە کە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی جێ باوەڕە کۆنەکان و ئەوەیکە نایزانێ لێیانەوە فێربێ .

● ● ●

فرانسیس بیکون وەك فەیلەسووفێك کە گومان لە تەجرید بکاتو بەراستی نەزانێ .. مەنهەجە – لێکەڕانی – یەکەی پالی پێوەنا بەرەو بەکار هێنانی بابەت کردن وەك کەرەسەیەك لە ڕێکخستنی جیهان .. ئەویش وەك پێویستییەکی سەرەکی بۆ پێشخستنی زانستی مرۆڤایەتی ..

بیکۆن لە سەر هەمان ڕای لوك Lock ئەڕواو ئەلێ : کە هەموو بیرێکمان لە دواجارا ئەنجامی هەستو هۆشە . پاشان وێنەیەکی سایکۆلۆژیانەی تەواوی بۆ بابەتکردنەکەی خۆی داناوەو .. هەموو لایەنەکانی بابەت کردنەکەی خۆی دەرخستووە کە لەسەر بناغەی سێ شتی « هۆشی مرۆڤایەتی » – بیرو ئەندێشەو هۆش بەندبووە –
Memory, Imagination and Reason
کەوا مێژوو شیعرو فەلسەفەیان لێرەیدا بووەو لەمە بەولاوە هیچی تر نیە .

بەمە ویستوویەتی لە ڕوانگەی ڕێکخستنی بابەتکردنێکەوە ، یەکگرتوویی هەموو زانستەکان بسەلمێنێ .. بەشەکانی زانستیش وەك لقو پۆپی درەختێك وان کەوا هەموو یەك ڕەگا کۆئەبنەوە .

لەگەڵ ئەوەی کەوا شێوەی بیکۆن لە بابەت کردندا لە بنەرەتەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوانەی کە بەر لەو پەیدابوون ، دەر ئەکەوێ کەوا بیکۆن گرنگیەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەرستۆ تالیس ئەویش کە لە ووتارەکانی ئەرستۆدا دەرئەکەون وەك « الثالوث الروائي » هەروەها « سێینەو چوارینە » کانی .

بیکۆن مێژووی شارستانێتی لە مێژووی سروشتی جیاکردەوە ، بەمەڕەگی جیاکردنەوەی زانست لە فەلسەفە داکوتا .. هەروەها باوەڕی بەوەهێناوە کەوا مێژووی شارستانێتی هەموو کاروبارێکی مرۆڤایەتیانەی لە خۆیا کۆکردۆتەوەو مێژووی سروشتیش هەموو ڕاستیەکانی سروشتی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە .

لێرەدا ئەبێ ئەوە ڕابگەیێنین کەوا بیکۆن کەوتۆتە هەڵەوە کە ڕایگەیاندووە « هۆش » لە ناو جێگای سنووردارا کار ئەکاو بیریش ڕاوەی تایبەتی هەیەو لە بازنەی مێژوودا ئەخولێتەوەو مێژووش تەنها گێڕانەوەی بەسەرهاتە . هۆشو ئەندیشەش دوو تەریبی دژبەیەكو دوور لەیەکن .. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بابەت کردنە کەی بیکۆن هۆیەك بوو بۆ ڕۆشن کردنەوەی سەدەی هەژدەهەم .. هەروەها بوو بەرێکا ئاسان کەرەوەیەك لە بەردەم نووسەرانو زانکۆییان لە ڕێکخستنی فەرهەنگەکانیان ، کە پلەیەکی بەرزیان هەبوو لە بڵاوکردنەوەی زانیاری ..

بابەت کردنەکەی بیکۆن – بەهەر سێ بەشە سەرەکیەکانیەوە – وەك نموونەیەکی تایبەتی مایەوەو بەڕێوبەرانی کتێبخانەکان پەیرەویان کردو بەردەوام بوون لەوە تا سەردەمی ئێستاشمان ( تەنها برونت ( Brunet ) نەبێ کە بەرەنگاری ئەم جۆرە دابەشینەی بیکۆن بووەوە ) .

گرتنە ئەستۆی ئەم بابەتکردنەش بە تایبەتی لە ئینگلتەراو فەرەنساو ئیتالیا دیاربوو .. بەڵام لە ئەمریکا تۆماس جیفرسون ئەم پرۆژەیەی لە کتێبخانە تایبەتیەکەی خۆیدا بەکار هێنا .. بەڵام کاتی کتێبخانەکەی بە حکومەتی ئەمریکی فرۆشت پاش جەنگی ساڵی ١٨١٢ ( بابەت کردنە بیکۆنیەکەی بووبە ڕێبازێك بۆ بابەتکردنی کتێبخانەی کۆنگرسی ئەمەریکی بەکار هێنرا تا پاش ساڵی ١٩٠٠ . تا ئەو کاتەی مارتلو هانزون Martel and Hanson ئەم بابەتکردنەی ئیستایان بۆ کتێبخانەی کۆنگرس دانا .

لێرەدا ئەبێ ئەوە بلێین کەوا بیکۆن لە دانانی بابەتکردنەکەی مەبەستی ئەوە نەبوو کە بەکار بهێنرێ لە ڕێکخستنی پەرتووکی کتێبخانەکان یان دنانی پێشەکی لە ببلیوگرافیاو ئینسکلوبیدیا . بەڵام بەرێوەبەری کتێبخانەکان ئەوەی کەوا لە بەردەستیانا بۆ بەکار هێنانی لە ڕێکخستنو بابەتکردنی کتێبخانەکانیان بابەت کردنەکەی بیکۆن بوو کەوا پێویستی ئەوانی بەجێ هێنا .

کتێبخانەوانەکان دامابوون بۆ شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەو تێگەیشتنی هەندێ لە لایەنەکانی بابەت کردنی دەیی « دیوی » .. بۆ نموونە .. هۆی چیە کەوا بابەتی « ئایین » یەکسەر ئەکەوێتە پاش بابەتی « فەلسەفە » وە ؟

بۆچی « کۆمەڵایەتی » بەچەند بەشێکی زۆر لە « مێژوو » دوور ئەکەوێتەوەو لێی جیا ئەبێتەوە ؟ بۆچی « زمان » لە « ئەدەب » جیا ئەبێتەوە ؟ پاشان بۆچی هەندێ بابەت هەن کەوا لە یەکتری نزیك ئەبنەوەو بەبێ ئەوەی پەیوەندی هەبێت لە نێوانیاندا ؟ ئەم گرفتە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا گرنگیەکی

ئەوتۆی هەبوو بەلای زانایانو کارکەران لە مەجالی بابەت کردندا .. بـەلام وەلامێکـی ئەوتۆی بۆ نەبوو تاوای لێهات کتێبخانەوانەکان وازیان لەم پرسیارەش هێنـا .

بەلام ـ ئیستکشافە ـ تازەکەی لیدیکـــەر Leidecker مەجالی دوو بارە بۆ لێکۆلینەوەی ئەم پرسیارە کردەوەو هەول درا بۆ وەلام دانەوەی .. لیدیکەر بە جۆرێ ڕوونی کردەوە ، کە گومانی تیـا نەمێنێ ، کەوا بەشەکانی بابەتە سەرەکیەکانی بابەت کردنی « دیوی » دەبێ ، بە جۆرێکی مێژوویانــە بەستراوە بە بابـەتکردنی « ولیم تۆری هاریس » ەوە کە بۆ کتێبخانەی گشتی قوتابخانە داناوە لــە سـانت لویس.St. Louis Public School Library باشان ئەم پرسیارە دروست بوو : بۆچی بابــەتو بەشـەکان لە بابەت کردنەکەی هاریس بـــەم جۆرە ڕێکخران ؟ ...

هاریس بـــە دانناني بەوەداو بە کارەکـــەی « هیکلی » بوو . لە سالی ( ١٨٥٨ ) ەوە تاکو سالی ( ١٨٧٩ ) فەلســـەفەی هیکلی خوێندووەو ئـــەم فەلسەفەیەی کردوە بە بنچینەی هەموو جموجۆلێکی خۆیو ئەیوت « کەوا مەنتیقی هیکل » تەوەری هەموو بیر کردنەوەیە کێتی لە سالی ( ١٨٦٠ ) ەوە .

هاریس ڕێبازێکی گشتیو کێشوەری بۆ بابەت کردن دانا ، بە جۆرێ کەوا بە کار بێ لە کۆمەلێکـی بچووك ( ٢٠٫٠٠٠ بەرگ ) وە یاخود گەورە ( بگاتــە ١٢٠٫٠٠٠ بەرگ ) لە پەرتووکو چاپکراو .. لیدیکەر بە نیشانکردنی جیاوازی نێوان ســــەری بابەتـــە سەرەکیەکان هەلسـا لە هەر بابەتکردنێکی هاریسانەو دیوییانە بەم جۆرە :

| دیـوی | | هاریس | |
|---|---|---|---|
| .... | ٠ – ٩٩ | زانســت | ١ |
| فەلسەفە | ١٠٠ – ١٩٩ | فەلسـەفە | ٢ – ٥ |
| ئایین | ٢٠٠ – ٢٩٩ | ئایین | ٦ – ١٦ |
| کۆمەلایەتی | ٣٠٠ – ٣٩٩ | زانستی کۆمەلایەتیو ڕامیارییەکان | ١٧ |
| | | نقـە | ١٨ – ٢٥ |
| | | ڕامیاری | ٢٦ – ٢٨ |
| | | زانستی کۆمەلایەتی | ٢٩ – ٣١ |
| زمـان | ٤٠٠ – ٤٩٩ | زمـان | ٣٢ – ٣٤ |
| زانستی سروشتی | ٥٠٠ – ٥٩٩ | زانستە سروشتیەکانو | |
| | | هونەرە باشـەکان | ٣٥ |
| | | بیرکاری | ٣٦ – ٤٠ |
| | | فیزیك | ٤١ – ٤٥ |
| | | مێژووی سروشتی | ٤٦ – ٥١ |
| | | پزیشکی | ٥٢ – ٥٨ |
| هونەرە باشـەکان | ٦٠٠ – ٦٩٩ | هونەرە باشـەکانو بازرگانی | ٥٩ – ٦٣ |
| | | هونـەر | ٦٤ – |
| هونەرە جوانەکان | ٧٠٠ – ٧٩٩ | هونەرە جوانەکان | ٦٥ |
| ویـژە | ٨٠٠ – ٨٩٩ | هۆنراوە | ٦٦ – ٦٨ |
| | | بەخشان | ٦٩ – ٧٠ |
| مێژوو | ٩٠٠ – ٩٩٩ | مێژوو | ٧٩ |
| | | جوگرافیاو گەشتەکان | ٨٠ – ٨٧ |
| | | مێژووی شارستانیەتی | ٨٨ – ٩٦ |
| | | ببیلوگرافیـا | ٩٧ |
| | | باشکۆی هەمەچەشنە | ٩٨ – ١٠٠ |

هاریس ڕێبازی بابەت کردنەکەی خۆی لـــە گۆڤاری ( الفلسفة التأملية ) دیاری کرد .. لەو دیاری کردنەی‌دا بۆ ئەوە چووە کەوا هـــەچ بابـەت کردنی پەرتووکێك ئەبێ بگەرێتەوە ـ باسابەکی فەلسەفی ـ بەلام بە هیچ جۆرێك باسی هیگلی نەکردووە .. بەلکو تیشکی خستۆتە سەر بابەت کردنەکەی فرانسیس بیکۆن لە بارەی زانستەوە ، لـە بارەی ئەوەی دەری بخات کە بە کەلك نایەت وەك بنچینـەیەك لە بابەت کردنی پەرتووك .. ئەمەش زۆر پێویست بوو چونکە ڕێبازی کتێبخانەی کونگرس ڕەگی خۆی لە فەلسەفەی بیکۆن‌دا هەیە .

بەلام جرا زیانۆ لە نامیلکە زانستیەکـــەیدا بۆ وەرگرتنی پلەی دکتۆرا بە دانانی کورتەیەك لـــە بابەتکردنەکەی بیکۆن دەربارەی زانست هەلساوە ـ بەهەمان چوار چێوەی کە هاریس دایناوبو ـ نووسەر ڕوونی کردبووەوە کەوا هیچ لێك چوونێك نیە لە نێوان بابەت کردنەکەی هاریس‌و بابەت کردنەکەی بیکۆن‌دا ، هەروەهـا هیچ لێـــك چوونێك نیـــــە لە نێوان بابەتکردنەکەی دیویو بابەت کردنەکەی بیکۆن‌دا .

ئەمەش کورتەیەکە لە بابەت کردنی بیکۆنی :

مێژوو
A مێژووی سرووشتی
a گشتیەکان
b Praetes
c هونەرەکان
B مێژووی شارستانیەتی
a مێژووی شارستەنیەتی ڕاست
b مێژووی کەنسی
c مێژووی ئەدەبی
C پاشکۆی مێژوو

هۆنراوە
A چیرۆکی ( داستانی )
B دراما
C مەجازی ، ئیستعاری ،
ئەفسانەیی .... هتد .

فەلسەفە
A لاهوت یان فەلسەفەی خواوەندی
B فەلسەفەی سروشتی
a تێڕوانینی
١ـ فیزیك
٢ـ میتافیزیکی
b کردەوەیی
C پاشکۆی ماتماتیك
١ـ ماتماتیکی رووت
٢ـ ماتماتیکی تێکەلاو
a وێنەکێشانی ڕووانی
b مۆسیقا
c فەلەك
d زانستی گەردوونی
e هونەری خانوو
f میکانیکا
D فەلسەفەی مرۆڤ
a فەلسەفەی مرۆڤایەتی
١ـ لەش
a هونەری پزیشکی
b وێنە هەستیەکان
هونەرە ( سەربەستەکان )
١ـ وێنەکێشانی زەیتی
٢ـ مۆسیقا
٢ـ گیان‌و لەش
٣ـ گیـــان
a گیانی بیر
١ـ جیهانە شاردراوەکان
a مەنتیق
b ڕەوشت .

هاریس بۆ ئەوە چووە کەوا بابەتکردنی بیکۆن هێشتا کەمە .. بەلام ئەگەر ئاوەژوو بکرێتەوە ، ئەو سێ بەشەی ئەبێت بە شێوەیەکی ڕاستەو باشتر . واتە زانست Science پێویستە وەك ئەوە بێتە پێشەوە کە ئەو ڕێبازو مەنهەجە پێشکەش بکات کە پاشـان مەبادیء لە دوایەوە دێت ئەمجا هونەرو مێژوو .

ئەم سێ بەشی زانستەش بـە پێویستـیەوە بەرامبەر هەمان ڕادەی سێ زانستەکە ئەبێتەوە کـە هیگل دایناوە.ئەویش (Begriff Wesen and Sein) و (Begriff) یش ڕادەی هۆشـــە بەجۆری پەیوەندیەك لەبـیری مەنتیقی‌دا هەیەو ( Wesen ) ئەو مەودایەیە کە تیادا تەعبیر لە ( بیرو ) ( ڕەمزو ) ( پەیوەنـدی بـە مەبەستەکانەوە ) ئەکری

هەروەهـــا Sein ڕادەی ژیانو مانــــەوەو بەسەرهاتی مرۆڤن . ئەم سێ بەشانەش ، ڕەنگــــە گرنگ ترین شت بن لە فەلسەفەی هیگلدا .

هاریس ئەوەی بۆ دەرکەوتووە کـــەوا بیکۆن جۆری دابەشکردنێکی بە کار هێناوە کەوا لەســــەر بناغەی شێوەو ناومرۆك دانراوە ، هەروەهـــا دانی بەوەدا ناوە کە ئەمە « ڕاستترین ڕێگایە » ، پاشان هاریس بە دیراسە کردنی « المنطق » ەکەی هیگل بە قوڵ بوونەوەیەکی زۆر هەڵساوە ... ئەمجــــــا پارێزکردنی هاریس بۆ ڕێبازی بابەت کردنەکــــەی [ لە پەڕتووکەکەیدا بە ناوی بابەت کردنی پەرتووك ] بەستراوە بە فەلسەفەی هێگلەوە ... بۆ تأیید کردنی ئەم مەبەستەو تاقی کردنەوەی جرازیانو بەوەرگرتنی چەند بەشێك لە پەڕتوکەکەی هاریس هەڵســــاوەو گەڕانوویەتی‌یەوە بۆ هیگل و بۆ ئەم مەبەســـــتەش ووتوویەتی کە وا هـــەر دووکیان واتـــــە ـ هاریسو هیگل ـ لەسەر یەك ئاواز ئەدوان ...

لە بەشی « هونەرە جوانەکان »دا هاریس ئەو بەشە لقانەی خستۆتە ئەستۆ کـــە هیگل دایناون . بەم پێیە هاریس لە دابەشکردنەکانیدا خۆی گونجان لەگەڵ هیگل داو زانیستیش پەرە ئەسێنێو نمائەکات لەســـــەر .

فەلســــەفە :

ئایین کە زانستی ڕەهایەو فەلسەفەش زانستی زانستەکانە هیگل بۆ ئەوە چووە کــــەوا « ڕەها » پێناسەیەکی میتافیزیکی‌یانەیە بۆ خوا .. هەروەهـــا زانینی هۆشـــــمەندی دەربارەی خوا گـــــەورەترین گیروگرفتی فەلســــــەفەیە ، ئایینیش زانســـــتێکی ـ گونجانە ـ بۆ ناسینی خوا .. پاشان « ئایین » لە ڕێکخستندا لە دوای فەلسەفەوە دێت .

هیگل بڕوای وابوو کەوا دەوڵەت تەنها لە ژێر سایەی خوادایە و کەسی ئادەمیزادیش ـ لە ڕێگای بەشداری کردنیەوە لەو یاسایانەی کە دەوڵەت دای ئەنێ ـ ئەگاتە بەرزترین پلەی « بەدەســـت هێنانی کەسی‌یانە » .

هاریس بەشی سێ‌هەمی لە زانستی پلـــــەی پیرۆزی سێ‌هەمین وەرگرتووە کە ئەویش « دەوڵەتە » .. لە بارەی ئەمەشـــەوە هاریس نووسیویەتی :

زانستە کۆمەڵایەتیەکانو ڕامیاری‌یەکان :

ئەو زانستانەن کەوا پەیوەندی لە نێوان مرۆڤـو هاوەڵەکانی لە کۆمەڵداو لە ناو دەوڵەتدا دروســـت دەکات . ژیانی پێویستی مرۆڤیش وەك ڕیندەوەرێکی « ڕووحی » بـــە زیندەوەری « کۆمەڵایەتی » بـــەوە ئەبەستێ .

هاریس ئەم زانستە کۆمەڵایەتیو ڕامیاری‌یانەی داناوەبە :

— نقـــە فێربوون
— ڕامیاری زمان
— ئابووری ڕامیاری

زمانیش وەك کارێکی « مەنتیقی‌یانە » خاتیمەی زانستە کۆمەڵایەتیە کانە کەوا هیگلو هاریس باسیان ئەکەن .. زمان جیاوازیـــــەکیش هەیە لــــە نێوان « ئەدەب » کەوا بایــــەخ ئەدات بـــەو ڕووە دیاری کراوانەی کە زمان دروستیان ئەکات .

لێرەدا بەشە مەوزوعیـــەکان تەواو ئەبن لـــــە بەشەکەی هیگلدا کە ناوی ناوە Begriff هەروەهـــا هــــاریس ناوی ناوە « یاســـــای هەســـــتیاری » Conscious System

بەڵام ڕادەی داهاتووی زانیاری بایەخ بە مەجالی « ڕاستی » ئەداتو ناو ئەنرێ بە « یاسای نەستیاری لە یەك بوونی بەشەکاندا » . Unconscious System of Onganio Unity

ئەمیش بەرامبەر بەو ڕادەیە ئەوەستێ کـــەوا هیگل دایناوەو بە ناوی Wesen ەو سروشتیش یەك بوونێکی عوزوی‌یە وەك کارێکی هونەری وایــــە .. هەردووکیان بریتین لە چـــەند چەشـــنو چـــەند جیاوازی‌یەك .. بەڵام بە گونجاندن سروشتیش لـــە پێش هونەرەوە دێ چونکە سروشت شێوەی « مادە » دیاری ئەکات .

لەم ڕوانگەیەوە بە « دیالیکتیکی ماتریالیزمانە » پەرەی سەندووە Dialectical Materialism

هاریس هەمان ڕای هیگلێ هەبووە لـــە بارەی پەرەسەندنی هەرسێ بابەتە سەرەکیەکە کەوا پێك هاتوون لە :

ماتماتیكو فیزیكو مێژووی سروشتی کـــەوا بریتیە لە کیمیاو زانستی زەمینو کشتوکاڵو ئاژەڵو ئەمجا پزیشکیو هونەرە چاکەکان Useful Arts .

ئەمەش جیاوازی دیاری کردنێکـــە لە نێوان بابـــەتکردنەکانی هاریسو هیگڵو بیکۆن دەربارەی هونەرە جوانەکان :

| هاریس | هیگل | بیکۆن |
|---|---|---|
| ٦٤ B هونەر | هونەرە جوانەکان | هۆنراوە |
| ٦٥ X١١ هونەرە جوانەکان | | |
| a هونەری خانووکاری | ١ـ هونەری خانووکاری | A چیرۆك پاڵەوانێتی |
| | | ( داستانی ) |
| b هونەری پەیکەرتاشی | ٢ـ هونەری پەیکەرتاشی | B دراما |
| c وێنەکێشانی زەیتی | ٣ـ وێنەکێشانی زەیتی | C وەرگرتن‌و ئەفسانە .. هتد |
| d چاپەمەنی | | |
| بەردی | | |
| e وێنە | | |
| f مۆسیقا | ٤ـ مۆسیقا | |
| ٦٦ X١١ هۆنراوە | ٥ـ هۆنراوە | |
| ٦٩ X پەخشان‌و | | |
| ئەدەب | | |
| چیرۆك | | |

که ئەبینین بیکۆن « مۆسیقا » و « هونەری خانوو » دائەنێ بە بەشە بچووکەکانی Subclasses « ماتماتیك » . هەروەها هەموو هونەرە جوانەکان لە ژێر فەلسەفەدا دائەنێ . لێرەدا ئێمە ئەزانین کەوا هاریس دابەش‌کردنەکانی خۆی لە کوێ‌هێناوە .

لە بارەی هونەرەوە ئەبینین کەوا ـ پێشکەوتنی هیگل ـ لە هونەرێکەوە پەیدائەبێ کە زۆر نزیك‌بێ لە سروشتەوە ئەویش هونەری خانووە (architecture) تا ئەگاتە هۆنراوەو پەخشان .. ئەمیش «خاوێنترین» جۆری هونەری‌یە .. چونکە زۆر دوورە لە مادەوەو بە زۆری ئەبەسترێت بە ئەندێشەو تێ‌ڕوانینەوە .

لە پاشان ئەگەینە ڕادەی سێ‌هەم کە ئەویش ( Sein ) ە « یان پەیوەندی‌یە عەرەزیەکان » ە Qccidental Relations ئەمیش ئەو مەجالەیە کەوا هیچ هۆیەکی دیاری کراوی نیەو یەك بوونێکی عوزوی نیەو بۆیە پەیوەندیەکان بەستراون بە تەواوەتی بە کات‌و شوێنەوە .

ئەمە ئەمانگەیێنێتە بەشی « جوگرافیاو مێژوو بیوگرافیا یان مێژووی ژیان » .

جارێکی‌تر هاریس لەگەڵ ئەلسەفەی هیگل‌دا یەك ئەگرێ لە بابەت کردنی مێژوو .

مێژوو
جوگرافیاو گەشتەکان
مێژووی شارستانیەتی
مێژووی ژیان

لە کۆتایی‌دا .. ئەتوانرێ بوترێ کەوا لیدیکەر Leidecker دەری خستووە کەوا سەری بابەتە سەرەکیەکان دەربارەی بابەت کردنی دیوی ڕێبازە نسبی یەکەی ئەبەسترێ بە ڕێبازی بابەت‌کردنی هاریس‌ەوە .. هەروەها هەردوو ڕێبازەکەی هاریس‌و دیوی زۆر لە زانستیەکان بەستوویانە بە ڕێبازی بابەت کردنەکەی فرانسیس بیکۆنەوە ..

بەڵام جرا زیانۆ بەڵگەی بە هێزی هێناوەتەوە دژی ئەم ڕاو بۆچوونە ..

بە بەڵگەی بەهێز سەلماندوویەتی ـ کەوا فەلسەفەی هیگل بە شێکی تەواو بووە لە ڕێکخستنی ئەم بەشانەو پێویستێتی بۆ « مەنتیق » لەم ڕێبازە بە پێی فەلسەفەی هیگل دروست بووە .

● ● ●

# زانست و تەکنەلۆژی هاوچەرخ

سلام محمد ئامادەی کردووە

گومان لەوەدا نییە کە شۆرشی زانستی‌ی تەکنەلۆژی‌ی هاوچەرخ بۆتە هۆی دروستکردنی کۆمەڵێ گۆڕینی چۆنەکی‌و شۆڕشگێڕانە لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا کە لە ئەنجاما چەند ڕێبازو تیۆرێکی تازەی وا دێتە ئاراوە کارێکی ڕاستەوخۆ دەکەنە سەر پاشەڕۆژی مرۆڤ‌و دەبنە هۆی گۆڕینێکی بنەڕەتی بنچینە سەرەکیەکانی شارستانیەت‌و بوارێکی لەبارو فراوان بۆ لە دایك بوونی کۆمەڵی نوێ‌و مرۆڤی نوێ دەرەخسێنن ..

پەیوەندی نێوان زانست‌و تەکنەلۆژی لەگەڵ کۆمەڵدا پەیوەندی‌یەکی تێهەڵکێش‌و ڕاستەوخۆیە بەو بەڵگەیەی ڕادەی زانستی‌و تەکنەلۆژی هەر کۆمەڵگایەك خۆی لە خۆیدا قۆناخە ـ کۆمەڵایەتیەکە ـ دەستنیشان دەکات و بۆ ڕونکردنەوەی زیاتریش پێویستە ئاگاداری ئەوەبین کە شۆڕشی زانستی‌ی تەکنەلۆژی هاوچەرخ لەسەر چوار بنچینەو کۆڵەکەی سەرەکی پێك هاتووە :

## یەکەم : داڕشتنی کاری ئەقلی لە چوار چێوەی دەسکەوتی زانستیدا

یەکەمین هەنگاوی شۆڕشی تەکنەلۆژی هاوچەرخ ڕێکخستنی کاروباری بەرهەمهێنانە لە ڕێگای داهێنانی کۆمەڵێ ئامێری جۆربەجۆر لە دەزگا بەرهەمهێنەرەکاندا کە لە جیاتی مرۆڤ لایەنی بەڕێوەبەرایەتی‌و ڕێکخستنی دەزگاکە دەگرێتە ئەستۆ .



بەم جۆرە .. ئەگەر شۆڕشی پیشەسازی لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە دا بووە هۆی جێگیربوونی ئامێر لە جێگای تواناو تەقەللای مرۆڤ بەڵام شۆڕشی زانستی‌ی تەکنەلۆژی هاوچەرخ بەمەندە نەوەستاو ئامێری بە شێوەیەك خستەکارەوە تەنانەت جێگای کارە ئەقلیەکانی مرۆڤیشی گرتەوە لە ڕێگای ئەقلی ئەلیکترۆنیەوە کە بەزووترین کات زاڵبوو بەسەر سەرجەمی لایەنەکانی بەرهەمهێناندا ..

نابێ ئەوەیشمان لە بیربچێتەوە کە ئەقڵی ئەلیکترۆنی ناتوانێ دەقاودەق جێگای کارە ئەقلیەکانی مرۆڤ بگرێتەوەو بە درێژایی پێشکەوتن‌و گەشە سەندنی ئەقڵە ئەلیکترۆنیەکە هێشتا کارە ئەقلیەکانی مرۆڤ بایەخی خۆیان دەمێنێ‌و زۆر وردە ئیشی وا جێبەجێ دەکەن ئەقڵە ئەلیکترۆنیەکە پەی پێ نابات .

**دووەم : بەکارهێنانی نوێی کیبەرنەتیکا**

بەکارهێنانی داهێنانە کیبەرنەتیکەکان لە مەیدانی زانستی‌و تەکنەلۆژیدا دووەم کۆڵەکەی شۆرشی تەکنەلۆژیای هاوچەرخە لە وانە : داهێنانی ئەقڵی ئەلیکترۆنی کە لە سەر بناغەی لە یەك چوونی ـ مێشك‌و ئامێر ـ لە وەرگرتن‌و رێکخستن‌و پاراستنی زانیاری‌یەکاندا دامەزراوە ، بەمەیش زوربەی گیروگرفتە ئیداری‌و هونەری‌یەکانی دەزگا بەرهەمهێنەرەکان لە ناوچوون ..

ئاشکراشە رۆژ لە دوای رۆژ بەکارهێنانی ئەقڵی ئەلیکترۆنی لە گشت بوارەکانی ژیاندا زیاتر پەرە دەستێنێ بە تایبەتی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا .

ئەم ـ بە ئامێر کردنی ـ ئەقڵی مرۆڤە هەنگاوێکی تازەیە لە مێژووی زانستاو هێشتا لە سەرەتای پێگەیشتندایە ، لە پاشەرۆژێکی نزیکدا دەبێتە هۆی :

١ ـ بەرزکردنەوەی رادەی خوێندەواری‌و رۆشنبیری لەو وڵاتانەی بیری زانستی‌و تەکنەلۆژی رەچاودەکەن .

٢ ـ زیادکردنی بایەخدان بە زانستی ئەندازیاری .

٣ ـ زیادکردنی ژمارەی زانایان لە بواری ماتماتیك و تەکنەلۆژی‌و لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیدا .

٤ ـ قووڵ کردنەوەی بایەخدان بە داهێنانی ئەلیکترۆنی لەم بارەیەوە زانا فەرەنسیەکان دەڵێن لە ماوەیەکی ئێجگار کورتدا ( رۆژنامەی ئەلیکترۆنی ) لە دایك دەبێت کە بێگومان ئەمیش تەقینەوەیەکی گەورەیە لە دنیای زانست‌و تەکنەلۆژی‌دا .

**سێیەم : بەکارهێنانی ئاشتی خوازانەی ئەتۆم**

ئەگەرچی ئەتۆم‌و تیشکەنەوەوی‌یەکان سامناکترین چەکی خاپوورکردنی شارستانیەتن‌و ئەو هێزە وێرانکەرەی لە ئەتۆمدا هەیە هەمیشە هەرەشەیەکی توندو تیژ لە شارستانیەت‌و ( ئاشتی

عێراقێکی سەربەخۆی رزگارو سوشیالیستیمان دەوێت .

صدام حسین

جیهانی ) دەکات لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بە نیازی بنیات نان‌و ئاشتی بەکاربهێنرێت ئەوا دەبێتە هۆی نەهێشتنی زوربەی گیروگرفتە زانستی‌و کۆمەڵایەتیەکان بێجگە لە دروستکردنی بەهەشتێکی بێ سنوور لەم سەر زەمینە دا .

بە درێژایی رۆژگار وڵاتە گەورەکان خۆیان بەم مەسەلە گرنگەوە خەریك دەکەن‌و کۆنگرەو کۆنفرانسی باڵای بۆ دەبەستن بەو ئومێدەی لایەنە وێران کەرەکەی ئەتۆم‌و چەك‌و تیشکە نەوەوی‌یەکان بگۆڕنە سەرلایەنێکی بنیات نەرو سوود بەخش .

**چووارەم : گەشتەکانی ئاسمان‌و گەشەسەندنی زانستە گەردوونیەکان**

بایەخدان بە زانستە ئاسمانی‌و گەردوونیەکان نیشانە یەکی ئاشکراو گرنگی شۆرشی تەکنەلۆژی هاوچەرخە ، لەو ئەنجامانەی تا ئێستا وەدەست هێنراون : چوونە سەر مانگ‌و .. دابەزینی گەلێ کەشتی ئاسمانی لە سەر ئەستێرەدوورەکان‌و .. بەکارهێنانی مانگە دەستکردەکان و .. زۆرانبازی مرۆڤ لەگەڵ ئەو ئەستێرانەی ملیۆنەها ساڵی هەتاوی لە زەوی‌یەوە دوورن ..

ئەمانە هەموو ، چوار چێوەیەکی فراوانی گەردوونی دەبەخشنە زانستی تەکنەلۆژی کە لە چوار چێوەی سنووری ـ زەوی ـ چۆتە دەرەوەو بەرەو جیهانە دوورو نە بینراوەکان هەنگاودەنێت .

# بەرەو پزیشکەوتن

# بۆچی منداڵ تووشی سکەئێشە دەبێت



زۆربەی باوكو دایكان سەرنجی ئەوەیان داوە منداڵەكانیان هەموو سەرلەبەیانی‌یەكی ڕۆژانی شەممەوان لە هەموو هەفتەیەكدا تووشی سكەئێشە دەبن ، كە ئەو ڕۆژە سەرەتای دەستپێ‌كردنی هەفتەی خوێندنە ، ئەوانیش گوێ‌یان پێ‌نادەن بە بیانووی ئەوەی هۆیەكە بۆ ئەوەی نەچن بۆ قوتابخانە ، بەڵام زۆر جاریش ڕوودەدات ئەم سكەئێشەیە تووشی منداڵان بێتو لە كاتی تردا بەبێ هیچ هۆیەك

دەبانگرێت ئەمەیش دەبێتە هۆی سەرلێ‌شێواندنو پەشۆكاوی بۆ دایكانو باوكان ، لەبەر ئەوە پزیشكەكان لەم حاڵەتە كۆڵانەوەو گەیشتنە ئەوەی دوو ڕاڤە بۆ ئەم تەگەرەیە بخەنە پێش چاو ، ئەوەبوو لێكۆڵەرەوەكان لە زانكۆی هارڤارد هەشتا منداڵیان هێنا تەمەنیان لە نێوان ٤ـ١٦ ساڵی‌دا بوون لێ‌یان كۆڵانەوە ، بینییان زۆربەیان لە دەستی ژانەسكو سكەئێشە دەناڵێنن ئەویش بە هۆی ئەوەوە گەدەو ڕیخۆڵەكانیان توانای هەلگرتنی شەكری شیریان نی‌یە .

بەڵام كۆمەڵی دووەمی لێكۆڵەرەوەكان ئەوەیان چەسپاند كە ئەو منداڵانەی لە دەستی ژانەسك دەناڵێنن لەوانەیە تووشی ژانەسەری نیوەیی بووبن بەڵام ژانەكە تووشی گەدە دەبێتو تووشی سەر نابێت ، ئەوەبوو لێكۆڵینەوەكەیان ئەوەی دەرخست ئەگەر یەكێك لە دایكو باوكی منداڵەكە سەرەئێشەی نیوەیی هەبێت لەوانەیە منداڵەكەیان بە شێوەیەكی جیاواز تووشی ببێت ، تووشی گەدەی بێت نەك سەری .

لە لایەكی تریشەوە تیۆری‌یەكی پزیشكی ئەمریكایی ئەوەی دووپات كردەوە كە ئەو ئافرەتەی ڕادەیەكی زۆر زیرەكی‌ی هەیە پتر تووشی سەرەئێشە دەبێتو هەمیشە بەردەوام دەبێت ، پەیوەندی‌یەكی بە هێزیش لە نێوان تێكچوونی سایكۆلۆژی‌و هەستكردن بە سەرەئێشەدا هەیەو ، سەرەئێشە بووەتە نەخۆشییەكی تەشەنەكردووی سەردەم .

شارەزاكانیش دەڵێن سێ جۆرە سەرەئێشە هەیە ، سەرەئێشەیەك لە ئەنجامی نەخۆشی سایكۆلۆژی‌یەوە دەبێت ، سەرەئێشەیەك ئەنجامی ئەوەیە خاوەنەكەی نەخۆشی‌ی لەشی‌ی هەیە ، سەرەئێشەیەك لە ئەنجامی زۆر كاركردنو مێشك بەكار هێنانەوە دەبێت .

لێكۆڵینەوەكە پەنجەی بۆ ئەوە ڕاكێشاوە كە ٧٠٪ ی ئەو سەرەئێشەیانە لە هەستكردن بە پەرێشانی‌و گرژبوونی دەمارو نەخەوتنەوە دەبێتو ٢٠٪ ی بە هۆی نەخۆشی‌یەوە دەبێت وەك تووشی سەرمابوون یان كەمهێزی‌ی چاو یان تۆقڵەی نێو لووت یان خواردنی باش نەخواردن یان ڕۆماتیزم ، ١٠٪ ی سەرەئێشەكان بە هۆی زۆركاركردنو زۆر مێشك بەكارهێنانەوە دەبێت .

## یاسای نوێی یەکێتی گشتی ئەدیب و نووسەرانی وڵات

لەم دوایەدا یاسای نوێی یەکێتیی گشتیی ئەدیبو نووسەرانی وڵات دەرچوو .

بەپێی ئەم یاسایە هەموو یەکێتیو کۆمەڵە رۆشنبیریو فیکریو ئەدەبی‌یەکان کە لە وڵاتدا بەپێی یاسای ترو بڕیارەکانی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش دامەزراونو ئامانجیان وەکوو ئامانجەکانی یەکێتی‌یە هەڵوەشانەوەو دوای جێبەجێ‌کردنی ئەم یاسایەیش ڕێ بە هیچ کۆمەڵە یان یەکێتی یان ڕێکخراوێك نادرێت ئیش بکات ئامانجەکانی وەکوو ئامانجەکانی یەکێتی بێت ، بەلکوو دەبێت هەموویان لە چوارچێوەی یەکێتی‌یە نوێ‌یەکەدا گرد ببنەوەو بە ناویەوە ئیشو کاریان ڕاپەڕێنن .

ئەم یاسایە ڕێگای بە ئەندامانی یەکێتیو کۆمەڵەکان داوە ، ئەوانەی مەرجی ئەندامێتی‌یان تێدایە ، داخوازی پێشکەش بکەن لە یەکێتی‌یە نوێ‌یەکەدا وەربگیرێن .

هۆی دەرچوونی ئەم یاسایەیش ئەوەیە بۆ دابین‌کردنی یەك‌گرتنی قەوارەی ڕێکخراوی هونەریو پیشەیی ئەدیبو نووسەرانو گرد کردنەوەی ئەرك‌و ڕەنجەکانیان بۆ پشتگیری‌کردنی ئامانجەکانی نەتەوەو لە پێناوی داکۆکی کردن لە نووسەرو نووسین پیشەی نووسەر بێتو ئیلهام وەرگرتن لە کەلەپووری نەتەوەیی عەرەبو ئیسلامو تێکۆشان بۆ بووژاندنەوەیو بەدووداچوونی بزووتنەوەی بەرهەمی ئەدەبیو ڕۆشنبیری لە نیشتمانی عەرەبداو دەرگا کردنەوە لە بەردەمی ئەدەبی پێشکەوتنخوازداو هەوڵدان بۆ دەرکردنی یاسا کە بەرهەمی نووسەران بپارێزێتو مافیان دابین‌بکاتو سەرپەرشتی کردنی بزوتنەوەی ڕۆشنبیریو ئەدەبیی نەتەوەکانی دیکەی وڵاتو چاودێری‌کردنی بارو دۆخێکی ئەوتۆ ماوە بە تواناو بەهرە داهێنەرەکان بدات لە بواری ڕۆشنبیری‌دا بە گشتیو لە بواری ئەدەبی‌دا بە تایبەتی گەشە بکەنو پەرە بستێنن .

## داوو دەرمانی میللی و سك پڕبوون

ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی ئێستا خەریکی لێکۆڵینەوەیەکی فراوانە سەبارەت بە پزیشك‌کاریی میللیو دەواکردن بە گیا لە پازدە دەوڵەتی جۆراو جۆردا .. « چونکە نزیکەی ⅘ دانیشتووانی جیهان هێشتاکە پشت بە پزیشك‌کاریی میللی دەبەستن بۆ پاراستنی تەندروستیی خۆیان » هەروەکوو دکتۆر جۆلیان گۆلد کە یەکێکە لەو زانایانەی لەم لێکۆڵینەوەیە ئەنجام دەداتو ئێستا لە مەڵبەندی چاودێری‌کردنی نەخۆشیەکان لە ئەتلانتای ویلایەتی جۆرجیای ئەمریکادا ئیش‌دەکات وتی :

لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوی جیهانی ئەوە دەگرێتەوە تا چی ڕادەیەك ئەم داوو دەرمانە میللی‌یانە کاریگەرن ، بۆ وێنە ، یەکێك لەو دەرمانانە ، دەرمانێکی چینی‌یە بە لاتینی پێی‌دەووترێت ( پۆرتولاکا ئۆبراکا ) کە گیایەکە وەکوو چایی لێی‌دەنێنو سك‌چوونی پێ چاك‌دەکەنەوە .

هەروەها گیایەکی تر کە چینی‌یەکان ، بەر لە هەزار ساڵ پێش ئێستا بەکاری‌دەهێنن ، بۆ ئەوەی نەهێڵن سك‌پڕبوون ڕووبدات واتە نەهێڵن منداڵیان ببێت یاخود بۆ ئەوە بەکاری‌دەهێنن ئافرەت سکەکەی بێ فڕێ بدات .. ئەگەر منداڵدان گەرای تێدابوو ئەوا ئەم گیایە چوونەوەیەکێك لە ناو منداڵدان‌دا دێنیتە کایەوە بەو جۆرە ناهێڵێت ئەو هێلکەیەی خەریکە ببێتە منداڵ تیایدا بڕوێت .. یان فڕێی دەدات ئەنجا ئافرەتەکە منداڵەکەی لەبار دەچێتو فڕێی دەدات ..

هەروەها لێکۆڵینەوەکە ( فاسۆلیا سەوزە )ی وڵاتی ( تیبت ) دەگرێتەوە ، ئەوەبوو زانایان لەم فاسۆلیایەدا نهێنیی ئەو دیاردە سەرسوڕهێنەرەیان دۆزیەوە کە ئافرەتانی ( تیبت ) پێی بەناوبانگن .. ئەویش ئەوەیە یان منداڵیان کەم دەبێت یان هەر منداڵیان نابێت .. ئەوان حەبی منداڵ‌نەبوون بەکارناهێنن لەگەڵ ئەوەیشدا دەیانبینیت منداڵیان نابێت وەك بڵێیت بەکاری‌دەهێنن .. کاریگەریی فاسۆلیای ( تیبت )یش لە ماددەیەکی کیمیاویدایە کە تێیدایەو ناوی ( ئیم ـ ئێکسبلوهیدروکوینۆن )ە .

# جیاوازی نێوان تەکنەلۆجی و تەکنیک

وشەی تەکنەلۆجی پەیوەندیی بەزانینی هونەری‌یەوە هەیەو ئەو کاروبارانەش دەگرێتەوە کە لەپێناوی بەرهەم و چاککردنیدا پەیوەندی‌یان لەگەڵ تەکنیك هەیە .. وشەی دووەمیش کە تەکنیکە بریتی‌یە لە مەکینەو ئامێری پیویست بۆ بەرهەم هێنانی کەرەسەیەکی دیاری‌کراو .

قسەکردن دەربارەی تەکنەلۆجی و هێنان وگواستنەوەی تەکنەلۆجی شیوەو سروشتێکی تایبەتی دەبێ .

بەلای هەندێ کەسەوە تەکنەلۆجی ئەو جادووەیەکە کۆمەڵی دواکەوتوو دەکات بە کۆمەڵێکی پێشکەوتوو .. بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو دۆخ و دەوروبەرەی کە ئەم تەکنەلۆجی‌یە تێیاندا سەری هەڵداوە .

**تەکنیکی نوێ و تێك ئاڵۆز هەمان ئەنجام نادات‌ە دست کە لە دەورو بەرەکەی خۆیدا دەیبێ ، ئەگەر بێتو ئەو پێداویستی‌یە بنەرەتی‌یانەی بۆ دابین نەکرێ کە لەکاتی سەرهەڵدانیدا لە دەوروبەرەکەی خۆی دا هەیبووە** . زۆر جاریش ئەم تەکنەلۆجی‌یە دەبێتە مایەی ئەوەی کە دەوڵەتێکی پاشکەوتوو بە هۆیەوە ببێ بە دەوڵەتێکی پاشکۆو سەر بە دەوڵەتە پێشکەوتووە خاوەن تەکنیکەکە ، سەرەرای ئەوەی کە مەکینە وئامێری نوێ لەدەرەوە هێنان جۆرە هەست کردنێکی خۆیەکی ئەوتۆ دروست ئەکات کە گومان لە توانای نیشتیمانی‌یانە بکرێ ..

هێنانی مەکینە و ئامێری ئەلیکترۆنی بۆ بەشی ( جیراحی‌ی ) دڵ لە خەستەخانەکان نموونەیەکە لەگەڵ دۆخی ئێستای پیشەیی پزیشکی‌ی وڵاتەکەماندا نزیك نی‌یە بۆ ؟ چونکە ئێمە خۆمان دەتوانین بگەینە ئەو رادەیەی کە ئەم مەکینە بەکارهێراوانە ناتوانن پێ‌ی بکەن . هەروەها لەتوانادا نی‌یە کە ئەمانە بێتە دی ئەگەر بێتو پزیشکەکە خۆی لەدەست نیشان کردنی نەخۆشی‌یەکەدا ئەوپەری وردو بەسەلیقە نەبێ دەوڵەت لەم مەیدانەدا هەموو توانایەکی خستۆتە کارو هیچ دریغی ناکات ئەو مەکینەو ئامێرە نوێ‌یانە داوا دەکرێن دەیان‌کرێت و دەیانهێنێ بەلام ئایا ئەو ئەنجامانەی دەستگیر بوون ئەوەندەی ئەو مە سرەف و ماندوبوون و یارمەتی‌یانەن کەلەم بارەیەوە پێشکەش کراون ؟!

هەڵبژاردنی تەکنەلۆجی نوێ و ئەوپەری پێشکەوتوو ، لە دروستکردنی ( چیمەنتودا ) شوێنەواری ناراستە و خۆی دەبێ کە لەوانەیە لەماوەیەکی دووردا دەربکەوێ و گران بکەوێ . چونکە راپەراندنی ئەم ئەرکە پێویستی بەوە هەیە کە ئەو تایبەتی‌یەتی‌یە تەکنیکی‌یانە دابین بکرین کە لەکاتی ئیش پێ‌کردنیدا لەتوانادا نین سەرەرای ئەوەی کە وەبەرهێنانەکەش گران دەکەوێ‌و زۆری تێدەچێ .

جا بۆیە هەڵبژاردنی جۆری تەکنەلۆجی‌یەکە بنەرەتی کاری جێ بەجێ کردنی بەرنامەکانی گەشەپێدان پێك دێنێ ، بەرەو گەیشتنە مەبەست کە وەدی هێنانی ئامانجەکانی بەر نامەکەیە . دووریش نی‌یە کە لێرەدا کێشەی پێوداگەکانی ئەم هەڵبژاردنە بێتە پێشەوە . لەنگەر گرتن و بەرامبەریی لە پەیوەندیی نێوان بەرهەم و بەرهەم داریی و تەکنەلۆجی دا شتێکی پێویستە بۆ ئەم مەبەستە .

# هەراو هۆریا هۆیەکە لە هۆیەکانی مردنە

هەروەکوو هەمــــوو دەزانین کە هەراو هوریا دەبێتە هۆی ئەوەی گوێی مرۆڤ کەڕ ببێت یان کپ ببێت ، هەروەها دەبێتە هۆی دەمارگرژیو تووڕەیی‌و زامە دوومەڵی گەدە سەرەڕای هەندێك نەخۆشــی‌و سەقەتی‌ی تر .. بەڵام ، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ئەوا هەراو هوریا دەبێتە هۆیەك لە هۆیەکانی مردن.. ئەمەیش زۆربەی خەڵك نەیانزانیوە کە لێکۆلینەوەیەکی نوێ ئەمەی چەسپاند ، ئەم لێکۆلینــەوەیەیش زانای پسپۆڕ ولیەم میچام ئەنجامی‌داوە .

ئــــەم لێکۆلینەوەیە دوو کۆمەڵــــە خەڵکــی گرتووەتەوە ژمــــارەیان هەشتا هەزار کەســــە ، کۆمەڵێکیان لە دووری‌ی سێ میــل لە فڕۆکەخانەی لۆس ئەنجلۆســــەوە دەژین ئەوی تریان لە دووری‌ی شەش میل لەو فڕۆکەخانەوە نیشتەجێن .. بەڵام هەردوو لا لە لایەنی تەمــــەن‌و داهات‌و نژادەوە .. سەرەڕای ژمارە .. وەکوو یەك وان .

لێکۆلینەوەکە ئەوەی پیشان‌داوە کە ژمارەی ئەو کەسانەی بە هۆی هەراو هوریای فڕۆکەخانەکەوە لە کۆمەڵەی یەکەم مردوون بە رادەی ١٩ لە ســـەد زیاترە لە ژمارەی ئەو کەسانەی لە کۆمەڵەی دووەم مردوون .. هەروەها ئەوەیشی پیشان‌داوە کــــە دڵڕاوەستان لە کۆمەڵەی یەکەم‌دا گەیشتووەتــــە نزیکەی ٤٠ لە سەد ، سەرەڕای ئەوەی جگەر ووشك بوونیان تێدا بووە بە ١٤٠ لە سەد ..

ئەم نەخۆشی‌یانەی دوایی هەراو هوریا بــــە شێوەیەکی راســــتەوخۆ کاریان‌تێ‌ناکات .. بــەڵام ئەوەی دەبێتە هۆی روودانیان گرژبوونی دەمارە .

## کوێرەکان فێردەکرێن بە شێوازی ئەلەکترۆونی بنووسن

ئەندازیارو لێکۆلەرەوەی تەکنەلۆژی ، کلاوز بیتەر شۆتهەر لە گەڵ کۆمەڵێك یارمەتی‌دەردا توانی‌ی پەرە بە سیستەمێك بدات ناوی ( کۆگای دەقەکانــی نووسینی برایل ب . ت . س . ٤ )ی لێ‌نراوە ، رێگا بــــە کوێرەکان دەدات چارەســــەری ئــــەو ئەنجام‌بەخشانە بکەن بە هۆی ئامرازی ئەلەکترۆنی‌یەوە بەدەست‌دێن ئەمەیش لە داهاتوودا شوێنی شایانی نیشن‌کردنیان بۆ دابین‌دەکات ، بــەم سیستەمــــە دەتوانرێت نووسینی تیشکی‌یانەی ئەلەکترۆنی بکرێتە تیپەکانی برایل کە لە نووسینی کوێرەکان‌دا بەکاردێت، هەروەها هەمــــان ئەندازیاری ناوبراو ئامێرێکــــی ژمارباری گیرفانی بۆ کوێرەکان داهێناوە بەهەمــــان سیستەم نیشن‌دەکات . ئێستایش لە یەکێك لە دام‌و دەزگاکانی مەشــــق‌پێ‌کردنی کوێرەکان‌دا دوو ئامێر تاقی‌دەکرێنەوە بەر لەوەی دەست بە دروست‌کردنی ئەم ئامێرانە بکرێت ، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی بەکاربهێنرێن . هــــەر ئامێرێــك لە پەردەیەکــــی تەلەفزیۆنی پێك‌هاتووە یە ( گیجیکەوە ) بەستراوە تیپی کوێرەکانی تیدایە لەگەڵ کۆگا ( کۆکەرەوەیەك )ی ئەلەکترۆنیانەی قەوارە بچووك‌دا دەتوانێت زانیاری کۆ بکاتەوەو بــــە خێرایی‌یەکی لەوتۆ پێشکەشــــی بکاتەوە ، ئەوەی تیایدا دەبێت لەوە زۆرتر بێت لە هەر کتێبێکی کوێرەکان‌دایە کە تیپی برایل نووسراوە. بڕیاریش دراوە ئەم سیستەمە لە دوا رۆژدا لــــە قوتابخانەی کوێرەکان‌دا بەکاربهێنرێت .





# ئەگەر دەتەوێت تەمەنت درێژبێت جگەرە مەکێشە

« کامیان هەڵدەبژێریت .. جگەرەکێشان یان ژیان » ئەمە ئـــەو دروشـــمەیە کـــە رێکخراوی تەندروستیی جیهانیی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لە رۆژی تەندروستیی جیهانیدا بەرزی کردووەتەوە، ئەوەبوو دکتۆر عبدالحسین طبا بەڕێوەبەری ناوچەیی رێکخراوی تەندروستی لە رۆژهەڵاتی دەریای سپیی ناوەڕاست بەم بۆنەیەوە پەیامێکی ئاراســـتە کردووە تیایدا دەڵێت :

« رۆژی تەندروســـتیی جیهانی لە ســـاڵی ١٩٨٠دا بۆ « پتر هۆشیاربوونی دەســـتەڵاتدارانی حکومەتو جەماوەری خەڵکی تەرخان کراوە سەبارەت بەو نەخۆشییەی کە دەســـتکردی مرۆڤ خۆیەتیو چەندین زیانی ئەوتۆی بۆ تەندروستی هەیەو ، چەندین ئەنجامی کۆمەڵایەتیو ئابووریی ترسناکی لێ دێتـــە کایەوە » .

ئەوەی راستیش بێت ئەو پەرەسەندنەی لـــە جگەرەکێشـــاندا هاتووەتـــە دی ، زۆربـــەی زۆری دانیشتووانی وڵاتە پەرەئەستێنەکان دەخاتە بـــەر مەترسی . هەروەها ئەوەیش دەرکەوتووە کـــــە پەیوەندییەکی ئەوتۆ لە نێوان جگەرەکێشانو زۆربەی نەخۆشییەکاندا هەیە ، هەروەها رادەی مردن لـــە نێوان ئەوانەی جگەرە دەکێشن لە ئافرەتو لەپیاو بەرزە .

زۆرترین ئەو نەخۆشییانەی پەیوەندییان بـــە جگەرەکێشانەوە هەیە ئەمانەن شێرپەنجـــەی سیو ، هـــەوکردنو ئاوســـانی سیو ، نەخۆشـــییەکانی ئەسکیمیی دڵو ، چەند نەخۆشییەکی تری دەمارە بچووکەکانی خوێن ، کە ٨٠ لە سەدی ئەوانەی دەمرن بە هۆی ئەم نەخۆشییانەوەیە . چەند نەخۆشییەکی تریش هـــەن بە شـــێوەیەکی ئاشـــکرا لـــە ناو جگەرەکێشـــەکاندا بڵاون وەکوو شێرپەنجەی لێوو زمانو زارو قورگو گەروو و میزەڵدان .

بەچاوپۆشینیش لە شوێنەواری جگەرەکێشان لە رادەی مردن ، ئەوا جگەرەکێشان دەبێتـــە هۆی پتربوونی رادەی نەخۆشی ، ئەمەیش دەبێتـــە هۆی نەچوونە سەر ئیشو کارو بەفیڕۆدانی کاتژمێرەکانی ئیش‌کردنو ، لەرادەبەدەر داواکردنی داوو دەرمانو خزمەتگوزرای پزیشـــکی کۆمەڵیش لەوەدا زیانی پێ دەگات کـــە ئەندامانیبەر لە ماوەی خۆیان دەمرن ، هەروەها تووش بوونی نەخۆشـــــی زۆرتر دەبێت ، ســـەرەڕای ووزەی بەرهەمهێنان .

لە رۆژهـــەڵاتی ناوەڕاستیشدا مەترســـــیی جگەرەکێشان بەو نەخۆشییانەوە ناوەستێت کە ناو بران ، بەڵکوو دەشبێتە هۆی شێرپەنجەی میزڵدان ، کە بە هۆی ئەو نیکۆتینەوە دێتە ئاراوە کـــە لە ناو دووکەڵی جگەرەدایە .

بەڵگەش ئەوەیە کە ئەو جگەرانەی لە دەرەوە دەهێنرێن رادەیەکی بەرزی قیریان تێدایە ، لە هەر جگەرەیەکدا ٢٠ ملغ قیر هەیە ، کە واتە کاکی خۆم تا زووە واز لە جگەرەکێشان بهێنەو بە دەستی خۆت تەمەنی خۆت بە فیڕۆ مەدە .

## چارەسەرکردنی شێرپەنجە نزیك بووەتەوە

لەم دوایەدا دەنگ‌و باسی زانیاریێ دەربارەی « ئەنتەرفیرۆن » بڵاوبووەوە ، کە ئێستا لە وڵاتی سوید تاقی‌کردنەوەی لەسەر دەکرێت ، ئەوەندەیش نابات ئەم تاقی‌کردنەوانە کاریگەریی « ئەنتەرفیرۆن » دەردەخەن ، نەك بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی‌و ژانە پیسەکان ، بەڵکوو بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی‌یە فیرۆسی‌یەکان .. ئەوەی دەربارەی « ئەنتەرفیرۆن » بووترێت ئەوەیە کە لە شانەی لەشی زیندوودایە ئەویش بەڕادەیەکی زۆر زۆر کەم ، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٥٧دا توانرا لە شاری لەندەن دابڕبکرێت‌و بخرێتە لاوەو شوێنەواری چارەسەرکردنەکانی بزانرێت .. لەو کاتەوە تاقی‌کردنەوەکان نەوەستان .. تا لەم دوایەدا تروسکەی هیوا سەرلەنوێ سەری‌هەڵدایەوە ئەویش بە هۆی ئەو سەرکەوتنانەی زانایانی ئەم بوارە وەدەستیان‌هێنان ئەوەبوو توانییان « ئەنتەفیرۆن » بە تێچوونێکی کەمترو چەندێکی فرەتر وەچنگ‌بهێنن ، ئەویش بە دابڕینی ئەو شانانەی ئەنتەرفیرۆن بەرهەم‌دەهێنن ــ بە شێوەیەکی سروشتی‌و گۆڕخستنە بەرهەمهێنانیەوە .

ئەوەی شایانی باسیشە ئەو چەندەی ئێستا لە ئەنتەرفیرۆن وەچنگ دەهێنرێت لە ١/٥ غرام زیاتر نی‌یە لە ساڵێکدا ، ئەمەیش لە زانکۆی هلسنکی لە فنلەندا بەرهەم‌دەهێنرێت .. بەڵام ئەو چەندەی مەبەستی چارەسەرکردن پێویستی پێیەتی لە ١/١٠٠ غرام زیاتر نی‌یە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی پیس‌و هەوکردنی ڤیرۆسی .

تاقی‌کردنەوەکان ئێستا لە وڵاتی سوێددا ئەنجام‌دەدرێن ، ئەویش بە یارمەتی‌ی ئەوەی فنلەندەی دراوسێی لە « ئەنتەرفیرۆن » بەرهەمی‌دەهێنێت ، ئەم تاقی‌کردنەوانەیش چارەسەرکردنی هەندێك نەخۆشی‌ی لۆکیمیا بە ئەنتەرفیرۆن دەگرنەوە ، ئەنجامە وەدەست‌هێنراوەکانیش زۆر بەلش‌بوون ، داڕۆژێکی پرشنگدار بۆ ئەم جۆرە دەرزی‌یە نوێیە داببین‌دەکەن .

## زاناکانی سوڤیەت : شارستانیەتی تر لە گێتی دا نی یە !

● زانای گەردوون‌ناسی سۆڤیەتی بەناوبانگ ( ترۆیتسکی ) نائومێدی‌ی زانا سۆڤیەتیەکانی دەربڕی چونکە تاکوو ئێستا هیچ بەڵگەیەکیان نەدۆزیوەتەوە ئەوە پیشان‌بدات کە ( شارستانیەتێکی پتر پێشکەوتوو ) لە شارستانیەتی مرۆڤ لە گەردوون هەبێت .

( ترۆیتسکی ) کە سەرۆکایەتی‌ی بەشێکی شارەزای ئەکادیمیای زانستی‌ی سۆڤیەت دەکات لە وتارێك‌دا یەکێك لە گۆڤارەکان بڵاوی کردووەتەوە ئەوەی دووپات کردووەتەوە کە پرۆگرامە تایبەتەکانی گەڕان بەدوای شارستانیەتی تری گێتی‌و هەروەها بە دوودا چوونی ( فەلەکیانە ) بە هۆی وەرگرتنی ئیشارەتی رادیۆو ئیشارەتی سەرووی دەنگەوە کە لەوانەیە لە ( ئادەمیزادی پێشکەوتوو ترەوە ) ڕووەو زەمین ئاڕاستە دەکرێت ، کە زانا سۆڤیەتی‌یەکان لە ماوەی ئەم دە ساڵەی دوایی‌یەدا ئەنجامیان داون تاکوو ئێستا ئەنجامێکی باشیان بەدەست نەهێناوە .

زانای سۆڤیەت پەنجەی ئاڕاستەی ئەوە کرد کە ئەم ئەنجامانە بە شێوەیەکی یەکجارەکی ئەوە دەدەنە دواوە کە ژیان‌و شارستانیەتێکی تری لەسەر یەکێك لە ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆر هەبووبێت پێش ژیان‌و شارستانیەتی سەر زەمین .

ترۆیتسکی شتێکی نوێی ووتووە کورتەکەی ئەوەیە کە دەست‌پێ‌کردنی ژیان لە ئەستێرەکانی تری گێتی‌دا لەوانەیش زەمین لە یەك کات‌دا بووە بەڵام مرۆڤ زۆر خێراتر توانیویەتی لەسەر زەمین ( شارستانیەتی پێك‌بهێنێت ) .. بەپێی ئەمە شارستانیەتەکەی پتر پێشکەوتووەو پەرەی‌سەندووە، لەوانەیشە شارستانیەتی دیکە بەر لە زەمین هەمان پێشکەوتنی بەدەست‌هێنابێت بەڵام ئێستا لەو ( ڕادە )دا نی‌یە بتوانێت ( ئیشارەت ) ئاڕاستەی زەمین بکات .

# بەرهەمی نوێ لە كتێبخانەی كوردیدا



## ● هەندێ مەسەلەی شانۆیی

لە بڵاوكراوەكانی كۆمەڵەی هونەرو وێژەی كوردی ـ مەڵبەندی گشتی لە سلێمانی كتێبی ( هەندێ مەسەلەی شانۆیی ) كە چەند نووسەرو ڕەخنەگرێك ووتارەكانیان وەرگێڕاوە ، لەم داوییەدا بڵاوكرایەوە .




## ● ژووان

لە شیعرەكانی ئەم ساڵانەی دواییەی بەرهەمی شاعیری ناسراو محمد حەمە باقی‌و لە بڵاوكراوەكانی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوكردنەوەی كوردی دیوانی « ژووان » كە لە ( ١٦٠ ) لاپەڕەی قەوارە گەورەو ، بە چەشنێكی هونەری ئەوتۆ لە چاپخانەی زانكۆی سلێمانی چاپكراوە ، كەوتە بازاڕی چاپەمەنی‌ی كوردی‌یەوە ، دیوانەكە بریتی‌یە لە ١٩ پارچە شیعری كورت‌و درێژو لە بەرگێكی قەشەنگدایەو لە ناوەوە بە چەند تابلۆیەكی جوان ڕازاوەتەوە ، ئەوەی شایانی باسیشە ئەمە یەكەمین دیوانی شاعیرە دەكەوێتە بازاڕەوە .



## ● سەرەتایەك لە فەلسەفەی كلاسیكی یۆنان

لە بڵاوكراوەكانی زانكۆی سلێمانی ـ كۆلیجی ئاداب ـ بەشی دیراساتی كوردی كتێبی « سەرەتایەك لە فەلسەفەی كلاسیكی یونان » كە كاك حمید عزیز نووسیویەتی چاپكراو كەوتە بازاڕەوە . ئەم كتێبە بەرگی یەكەمی چوار بەرگە كە نووسەر لەپێشەكی‌یەكەیدا بەڵێنی‌داوە چاپیان بكات . بەرهەمەكە دەكرێ بە دوو بەشەوە ، لەبەشی یەكەمدا بەتێكڕای تیشكی خستۆتە سەر بابەت‌و لقەكانی فەلسەفەو لەبەشی دووەمدا باسی فەلسەفەی یۆنانی كردوەو یەكە یەكە فەلسەفەی فەیلەسوفەكانی باس‌كردوە . كتێبەكە قەوارە گەورەی ٣٦٠ لاپەڕەیە.

● لاکێشە ڕووناکەکان

لـــەم دواییەداو لە بلاوکردنـەوەی دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی کۆمەڵە چیرۆکێکی کاک عبداللە ســـراج لەژێر ناونیشانی « لاکێشـــە ڕووناکەکاندا » کەوتـــە بازاڕەوە ، ئـــەم کتێبە ١٦ چیرۆکی خنجیلانـەی گرتۆتە باوەش کە نووســـەر لەنێوان ســـالانی ١٩٧٤و ١٩٧٨دا نووســـیونی و هەندێکیان لــە گۆڤارو ڕۆژنامــە کوردییەکاندا بلاو کراوەنەتەوە .




## بەرپشەوە بە سەر بردی فرمێسکا

کومەڵێك شیعر بە ناونیشانی ( بەرپشەوە بـــە سەر بردی فرمێـــسکا ) لە لایەن جەلال شکاوە لە ٨٨ لاپەڕەی قەوارە بچووکدا کەوتە بازاڕەوە ، ئـــەم بەرهەمە بریتییە لە سەرەتای دەستپێکردنی نووسینی شـــاعیر .

قوتابخانە میللی یەکان
خاڵێکی وەرچەرخانن
لە کاروانی بنیاتنانی
سۆشیالیستی دا

قوتابخانە میللی یەکان ڕێ‌و
شوێنێکی پەرەسەندوون
لە ڕێ‌و شوێنەکانی هەڵەتی
نیشتمانی

## ● پێناس بە شاعیرانی کورد

لەژێر ئـــەم ناونیشانەدا کاك ئەسعەد عـــەدۆ کتێبێکی بچووکی لەسەر هەندێك شاعیری کلاسیکی کۆ کردووەتـــەوەو لەگـــەڵ چەند نموونەیەکی شیعرەکانیاندا لەچاپی داوەو ، لەم دواییەدا کەوتـــە بازاڕەوە .

## داغستانی من

لە چاپکراوەکانی یەکێتیی نووســـەرانی کورد کتێبی شاعیری داغســـتانی ڕەســـوڵ حەمزەتوف ( داغستانی من ) کە کاك‌عەزیز گەردی بەشی یەکەمی لە ئنگلیزی‌یەوە کردوە بە کوردی ، کەوتـــە بازاڕەوە چاوەڕوانی بەرگەکانی دیکەیین .


ڕەسووڵ حەمزەتۆف

داغستانی من

ـ کتێبی یەکەم ـ

عەزیز گەردی

لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویە بە کوردی

لە بلاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کوردە

بەغدا ـ چاپخانەی (علاء)

١٩٧٩

# وشەی پرشنگدار

ئەرکی بەدیهێنانی سەربەخۆیی سیاسی لە ڕوخسـاردا شۆڕشی چواردەی تەممووزی ١٩٥٨ جێبەجێی کرد لە کاتێکدا ڕژێمی مەلەکی کۆنەپەرستانەی بەکرێگیراوی تەفروتووناکردو لە جێیا سیستەمی کۆماری دامەزراندو هەموو پەیوەندی یەکی عێراقی بە پەیمانی ئیمپریالیستیانەی بەغداوە پچڕاندو پارەی وولاتی لە پاشکۆیەتی ئیستەرلینی ئازادکرد .

بەلام ناوەڕۆکە سیاسیو ئابووریو فیکرییەکانی سەربەخۆیی سیاسی بە نیوە چڵیو لاوازی مانەوە کە بە درێژایی دە سالی پاش شۆڕش بە شێوەیەکی هێجگار پڕ مەترساویانە هەڕەشەیان لێ ئەکردو زۆر جاریش لە ناوەڕۆکە ڕاستەقینەکەی خۆی بەتالیان دەکردەوە .

دەبوایە پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست کە لە پێناوی یەکگرتنو ئازادیو سۆشیالیزمو دامەزراندنی کۆمەلی عەرەبی سۆشیالیستی دیموکراتیانەی ئازادو یەکگرتوودا خەباتی دەکردو ، دەسەلاتدارێتی سیاسیشی لە هەرێمێکی عەرەبیدا وەکو سەنگەرێکی پێشەوە بۆ خۆیو بۆ بزوتنەوەی شۆڕشگێرانەی عەرەبی بەدەس‌هێنا ، ئەبوایە ئەم مەسەلەیەی بە شێوەیەکی ڕیشەییانەی تەواو چارەسەر بکردایە ، بۆ ئەوەی دوابەدوای ئەوە دەست بداتە جێبەجێ کردنی ئەرکە دیموکراتیو سۆشیالیستیو یەکگرتنەکانو لەم بارەیەوە نموونەی تەواو ڕاستەقینە پێشکەش بە بزوتنەوەی شۆڕشی عەرەبو .. بە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی لە جیهانی سێیەمدا بکات .

یەکەم ئەرکێ کە شۆڕشی حەڤدەی تەممووز لە بواری هێنانەدی ناوەڕۆکەکانی سەربەخۆیی سیاسیو پتەو کردنیدا ڕووبەڕووی بووەوە ؛ لەناوبردنی تۆڕە سیخورییەکانو بەکرێگیراوەکانی بوو بە شێوەیەکی بنەڕەتیو ببڕای ببڕ .

دووەم ئەرکیش کە لە بواری پتەوکردنی سەربەخۆیی سیاسیو ئازادکردنی خواستی نیشتمانی لە هەموو کۆتێك بەرەو ڕووی شۆڕش دەبێتەوە « بنیان نانی دەسەلاتدارییەکی ناوەندیی نیشتمانی بەهێز »ە .

پتەوکردنی دەسەلاتدارێتی شۆڕشو سەرکردایەتی کردنی لەلایەن حزبەوە سەرکردایەتییەکی نیشتمانیانەی توندو تۆل ، ناوەڕۆکێکی ڕاستەقینەی بە سەربەخۆیی سیاسی بەخشیو بەسەر دەزگاکانی دەولەتو دەستە جۆراوجۆرەکانیدا سەپاندی کە لە هەلویستی خواستی نیشتمانی سەربەستانەوە بەرژەوەندییە نیشتمانیو نەتەوەییەکانەوە ڕەفتار بکەن .

حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە بایەخێکی گرنگی بەم لایەنە داوەو ، داوای ڕۆشنبیرکردنی جەماوەران بەگشتیو لاوان بەتایبەتی کردووە ، ڕۆشنبیرییەکی نەتەوەییو سۆشیالیستیو دیموکراتیانە ، بۆ ئەوەی بەم لایەنە فیکرییە بکرێنە قەلایەکی سەخت دژی ئەو تۆڕو تەوژمە فیکریو ڕۆشنبیری بێگانانەی ، کە لەگەل ئامانجە نەتەوەییو مرۆڤایەتییەکانماندا ناگونجێن ، لەگەل ئاگاداربوونیشدا لەوەی خۆی لە دوورەپەرێزیو دەمارگرژی بپارێزێت بەرامبەر ئەو ئایدیۆلۆجیو ڕۆشنبیرییە مرۆڤایەتیانەی کە خزمەتی مەسەلەکەمان دەکەن لە ئازادبوونو بنیاتنانی سۆشیالیستیدا

**ڕاپۆرتی سیاسی هەشتەمین**
**کۆنگرەی هەرێمایەتی**

نرخی ٥٠ فلسە

ئەم ژمارەیە ١٢٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە

طبع بمطبعة الزمان - بغداد

رقم الايداع فى المكتبة الوطنية ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

ROSHINBIRY NWE
General Monthly Magazine
Issued by : The Kurdish House For Culture and Publishing
Ministry of Culture and Information
Baghdad — Iraq

رؤشنبیری نوێ
مجلة شهرية عامة
تصدر عن : دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغـــداد

